# وینەی ڕەگەزی مێ

## لە دیوانی ژنێک لە جنسی باران



دوکتۆر
کوردستان موکریانی

به ناوی خودای میهرەبان

**وێنەی ڕەگەزی مێ لەنێو دیوانی**

**ژنێک لە جنسی باران**

| | |
|---|---|
| سرشناسه : | موکریانی، کوردستان |
| عنوان و نام پدیدآور : | وینەی رەگەزی می لەنیو دیوانی ژنیک لە جنسی باران (قوبادی جەلیزادەدا)/ دانەر کوردستان موکریانی. |
| مشخصات نشر | مریوان: ، ۱۳۹۹. |
| مشخصات ظاهری : | ۹۶ص؛ ۱۴/۵ × ۲۱/۵ سم. |
| شابک | ۹۷۸-۶۰۰-۶۹۶۲-۷۲-۶ |
| وضعیت فهرست نویسی : | فیپا |
| یادداشت : | کردی. |
| موضوع | جلی‌زاده، قباد -- نقد و تفسیر |
| موضوع | شاعران کرد -- عراق -- قرن ۲۰م. -- سرگذشتنامه |
| موضوع | -- ۲۰th century -- Poets, Kurdish -- Iraq Biography |
| موضوع | شعر کردی -- عراق -- قرن ۲۰م. -- تاریخ و نقد |
| موضوع | -- ۲۰th century -- Kurdish Poetry -- Iraq History nd criticism |
| موضوع | زنان در ادبیات |
| موضوع | Women in literature |
| رده بندی کنگره | PIR۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی : | ۸فا۹/۲۱ |
| شماره کتابشناسی ملی : | ۶۲۱۴۶۷۶ |

# وێنەی ڕەگەزی مێ لەنێو دیوانی
# ژنێک لە جنسی باران


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | وێنەی ڕەگەزی مێ لەنێو دیوانی ژنێک لە جنسی باران |
| ✓ دانەر (نویسندە): | د. کوردستان موکریانی |
| ✓ دیزانی بەرگ (طرح جلد): | ڕێبوار چراغی |
| ✓ دیزانی ناوەوە (صفحەآرایی): | ئەسعەد ئەحمەدی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم (اول)؛ ١٣٩٩ـ٢٠٢٠ |
| ✓ ژمارەی چاپکراو (تیراژ): | ٥٠٠ بەرگ (جلد) |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە و قەوارە (تعداد صفحات): | ٩٦ لاپەڕە (صفحەی مینیمال) |
| ✓ ناشر (خانەی چاپ و بڵا کردنەوە): | خانەی چوارچرا |
| ✓ شابک: | ٦ـ٧٢ـ٦٩٦٢ـ٦٠٠ـ٩٧٨ |

✓ نرخ (قیمت): ١٥,٠٠٠ تمەن ـ ٢٥٠٠ دینار

ناوەندی بڵاوکردنەوە: سلێمانی، سەرەتای شەقامی مەولەوی فەرعی سەعید تەها کۆیی.خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

تەلەفوون: ٠٧٥٠١١٢٨٣٨٨

# پوختە

لەسـەردەمانی کۆنـەوە، تا ئەمـڕۆ گۆڕانکارییەکـی گەورە لـە ژیانی ئێمەی رەگـەزی مێ بەتایبەتی و کۆمەڵ بەگشـتی روویـداوە. ئافرەت لەسـەر ئاسـتی خوێندەواری، زانسـتی، زانیاری گشـتی، تەکنۆلۆژی، رۆشـنبیری، کارگێـڕی، ئابووری، رامیـاری، چالاکـی جۆراوجـۆری جڤاکـی هەنـگاوی باشـی هاویشـتووەو لـە زۆر لایەنەوە پەرەی سـەندووە، کەچی لەم سـاوە تا نهـۆ وێنـەی ئێمـەی رەگەزی مـێ لەنێـو هۆنراوەی کوردیدا ، بەشـێوەیەکی گشتی هەر وێنەی سەدانی بوورییە، بەڵام بە لێکچوواندنێکی هاوچەرخانە.

وێنەی شائیرانی رەگەزی نێر بەشێوەیەکی سەرەکی تەنێ جەستە و جوانی رووکەشی دەرەوەمان دەگرێتەوە. بوێژانمان لـە وێنەکانیانـدا زۆرکەم هێمـایان بۆ رادەی هـزر، تێڕوانین، کردە و چالاکییەکانی ئێمەیان کردووە.

وێنەی رەگەزی مێ لەنێو دیوانی ژنێك لە جنسـی بارانی قوبادی جەلیزادەدا توێژینەوەیەکی وەسـفی شـیکارییە. ئەم وێنانە شـیدەکاتەوە، کە جەلیـزادە بۆ ئێمەی رەگەزی مێی بە وشە کێشاوە.

قوبادی جەلیزادە لەنێو شـاعیرانی کورد بـەوە نێودارە، کە ناوەرۆکـی زۆربـەی هۆنراوەکانـی بۆ جەسـتەی رەگەزی مێ تەرخانکردووە و بەتایبەتی بۆ باخی سێوان.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدراوە بزاندرێت ئایا جەلیزادە هەر جەستەی رەگەزی مێی مەبەستە، یان پەلی بۆ بابەتانی دی، کە بەندیواری بە ژنەوە هەیە، هاویشتووە؟

ئـایا جەلیـزادە لـە وێنەکانیدا هـەر رووکەشـی دەرەوەی رەگـەزی مێـی خسـتۆتەروو، یان ناخی دەربریـوە و بایەخی بەرۆڵـی گرنگی لە ژیانـی رۆژانەیدا داوە ؟ جەلیزادە تا چەند راسـتگۆیانە لـە خـۆی دواوە و راشـکاوانە رازی دڵی خۆی بۆ خوێنـەر و بـۆ هاورەگـەزی بەرامبـەری درکانـدووە؟ جۆری وێنەکانی بەرجەستەکراو، ئایا ئەرێنین، یان وێنەی نەرێنین؟

ئەمانە و چەندین پرسیاری دی و نـەبـوونی توێـژینەوەیەك تایبەت بەم باسە لەنێو دیوانی ژنێك لە جنسی باراندا بوون بەهـۆی نووسـینی لێکۆڵینەوەیەکی سـەربەخۆ لەم بابەتەی لەژوورروو باسکراودا.



## زمان لەنێو دیوانی ژنێك لە جنسی باراندا

زمـان ڕەگەزێکـی بنچینەیە لـە بنیاتنانی شـیعردا، چونکە وێنەی هونـەری لەنێو زماندا بەرجەسـتە دەبێت. هەڵبژاردنی وشـە بـۆ دەربڕیـن لـەو بیرۆکـەی، کـە شـائیر دەیەوێـت بەرێگەیەوە دەریببڕێت، توانای شائیرێتی شائیر خۆیادەکات. جۆری دارشتنی مانای ئەو پەیڤانەی بوێژ لە دنیای ڕەوانبێژیدا وەك: خواسـتن، لێکچوواندن، هێماکردن و.. دەیانبەخشـێت، دەبێـت ئەوەند کاریگەر و بزوێنەر بن، لە ئەنجامیدا خوێنەر و بیسەر تاموچێژی لێوەربگرن و دووچاری هەڵچوون بن.

جەلیزادە هەوڵیداوە زۆربەی هۆنراوەکانی نێو دیوانی نێوبراودا بـە زمانێکـی وێژەیـی بنووسـێت. زمانێـك تایبەت بـە خۆی. زۆربەی وشـەکانی ڕەنگدانەوەی سـیمای سـەردەمەکەی خۆی بێـت. پەیڤەکان لە ڕاژەی بیرۆکـەی هۆنراوەکانی دابێت. لەباری لێکچوواندندا زۆر وەسـتایانە مامەلە لەگەڵ وشـەی فەرهەنگی شـیعردا بکات. لەپێنـاو بەهێزکردنی مانای وشـەکان و بزواندنی هەسـتی بەرامبـەری، هێندێـك پەیـڤ، یان هێندێـك فرێـز و رسـتە لەنێو یـەك هۆنـراوەدا دووپاتکردۆتەوە. هـەروا هەوڵیداوە بـۆ ڕاکێشـانی سـرنجی خوێنەر چەند وشـەیەك تیـپ بە تیپ بنووسێتەوە، یانی هەر تیپەی دێڕێکی تەواوی بۆ تەرخانبکات.

شـائیر له هێندێك باردا، لەپێناو گەیاندنی بیرۆکەیدا، نەك هـەر لە هۆنینەوەی هۆنراوەی کلاسـیك، بەڵکـو لە هۆنراوەی ئازادیشدا خۆی له بەند و کۆت رزگارکردووە، لە هێندێك باردا گوێی بە ریتمی هۆنراوەکانی نەداوە.

لەو وشـانەی، کە زۆر لەنێـو ئەم دیوانەدا بەرچاو دەکەون و بوون بە وشـەی فەرهەنگی شیئری ئەو، ئەمانەن: ژن، ژنی رووت، کـچ، گەورە کچ (قەیرە کـچ)، کچی عازەب، مەمك، سینگ، ستیان، دەرپێ.

پیـاو، مێـرد. سـەر سـپی. باران، هـەور، پەڵـە هـەور، ئـاو. هەنگویـن، درەختـی هەنگوین، کانـی و رووباری هەنگوین و.. وەرزەکانی سـاڵ، بە تایبەتی پایز. درەخـت، داری رووت، داری سێو. گەڵا، گەڵای هەڵوەریو، چلە نێرگز، گوڵ، یاسەمین، ئینجانە و.. با، کزەبا، رەشەبا، پەپوولە، کۆتر، چۆلەکە. کەناری. رەنگەکان، بە تایبەتی: مۆر، سپی، رەش. پەنجەرە، دەرگە، گۆچان و...

ئـەوەی لـە رێنووسـی ئـەم دیوانـە بەرچاودەکەوێـت بەکارهێنانـی تیپـی(ص، و، ط) بـۆ ئـەو وشـە بیانییانـەی کەوتوونەتە نێو هۆنراوەکانی، هەرووەك لە ژێرەوە تۆمارمکردوون. ئەم دوو دەنگـە لە زمانی کوردیدا نین، لەبرێتی ئەوان (س و ت )ێ بەکاردێـن، وا باشـتر بـوو، کە جەلیـزادە وەك گۆکردنە کوردییەکەی بینووسیبا.

قـەناص ل. ٢٥ و ٦٩٦ طاعـون ل. ١٧١ طـاق وەسـان ل. ٤٤٣ نیـو گـەص ل. ٥٥٧ صنـدوق ل. ٥٧٠ پاص ل. ٦٧٤ گەرەكی صەدر ل. ٦٧٦ وەصل ل. ٧١٠ .



## وێنەی هونەری لەنێو دیوانی ژنێك لە جنسی باراندا

وێنـەی هونـەری // وێنەی شـیئری // وێنـەی ئەدەبی بابەتێكـی تازە نییـە، چونكە هەبوونی شـیئر لەسـەر وێنەی هونەری پێوەسـتە.لە سـەردەمانی كۆندا شـیئر بە وێنەیەكی هونـەراوی لێكدراوەتەوە. لەگەڵ سـەرهەڵدانی شـیئردا وێنە هەر هەبووە، بەڵام راڤەی جۆراوجۆری بۆ كراوە.

رەخنەگـران لەكۆندا لـە بواری وێژە و بە تایبەتی شـیئردا هـەر تەنێ بایەخیان بە لایەنی رەوانبێژی، وەك لێكچوواندن، خواستن و دركەیی داوە، لایان بەلای وێنەی هزری، رەمزی، فەلسەفی و دەروونی نەكردووە.

وێنـە لـە هۆنـراوەی نوێـدا برێتییـە لـە ورتـەی نهێنـی خودی شـائیر، دوواندنی دەروونی و كاریگەریكردن لە سـەر هەستەكان. شـائیر هەوڵدەدات، كە پەیڤەكانی رەنگدانەوەی ئـەم چەمكانە بن ، كە تەنێ لە رێگەی وێنەی شـیئرییەوە، ئەو بارەی پێیدا تێدەپەڕێت، دەتوانێت بەرجەستەی بكات.

**شەو،**

**ماچێکی گەرمم،**

**بە دەسکی پەنجەرەی ژوورەکەتەوە،**

**هەڵواسی.**

**تۆ هەر نەتکردەوە.**

**بەرەبەیان پشیلەیەکی چاوزەرد،**

**کەمێك بۆنی پێوە کرد و خواردی.** (ل. ٥٤٢)

وێنـەی یەکـەم و سـێیەم بە تەنکـراون، وێنـەی دووەم رووداوی تێـدا رووی نـەداوە، هەرسـێ وێنەکـە تاکن، بەڵام ئاوێتەی یەکتری بوون و وێنەیەکی لێکدراویان دروستکردووە.

جەلیـزادە بە شـائیری ئیرۆتیك، یان شـائیری جەسـتەی ژن و بـە تایبەتـی باخـی سـێوان ناوبانگی دەرکـردووە. وێنە هونەرییەکانـی ئـەم بابەتـەی لەچاو شـائیرانی پێش خۆی و سەردەمی خۆی زۆر بوێرانەتر بەرجەستەکردووە:

**شەو بە رووتی دەخەوێ..**

**مەمکدان و دەرپێکەی،**

**فڕێ دەداتە،**

**ئاگردانەوە.**

**سبەینان،**

**لە داوەدەزووی کازیوە،**

**دەیان چنێتەوە.** (ل. ١٤٤)

وێنەی شـیعری پێوانەیە بۆ رەسەنایەتی ئەزموونی شیعری هەر شـائیرێك، رادەی کاریگەری لەسـەر گوێگر و خوێنەر هێمای توانای ئەون لەم بوارەدا.

لەنێـو هۆنراوەکانـی دیوانـی ژنێك لە جنسـی باراندا ، زۆر وێنەی شیعری جوان و کاریگەر بە وشەی پڕ لە واتا دارێژراون، بەڵگەن بۆ رەسەنایەتی ئەزموونی شیعری جەلیزادە.

وێنەی شیعری پرۆسەی کارلێکردنێکی ئاڵوگۆرکراوە لەنێوان شـائیر و وەرگـردا، جەلیـزادە لـە رێگـەی شـێوازی تایبەتـی خـۆی، توانیویەتـی لەزۆر باردا ئەم پرۆسـەیە سـەرکەوتووانە ئەنجامبدات.

ئەو ژنە،
لەوەتەی مێردەکەی سەفەری کردووە،
بە رووتی دەخەوێت.
هەورێکە،
پڕە لە بارینی لەزەت. (ل. ٧٤)

جەلیـزادە لەم وێنەی ژوورووەدا پەنای بردۆتە بەر هونەری لێکچوواندن، کە تێیـدا ژن لێچووە و هەور لەوچووە. هەردوو توخم رووتی و بارین دەیانگرێتەوە.

سـەرچاوەی وێنەی هونـەری جەلیزادە خـودی خۆیـەتی و هـەروا سـەرچاوەی بابەتیش، کە سـوودی لـە کەلەپوور و

بەرهەمی شـائیرانی پێش خۆیەتـی، هەروەك خۆی لە لاپەڕە ٥٦٦ ی دیوانەکەیدا دەڵێت:

«شـیئریش ئالآیەکـی لەمێژینـەی نیشـتمانی سـۆز و خۆشەویسـتییە، ئـەم لەوی دیکـەی وەردەگرێت و ئەویش رادەستی ئەوانی دیکەی دەکات ، ئیدی تا هەتا ... شیئر بەقەد ئـەوەی خولقاندنە، بۆ ماوەشـە... بە قووڵی بـڕوام بەم گۆتەیە هێناوە: هیچ داهێنانێك یەك خاوەنی نییە!».

## یەکەم: وێنەی جەلیزادە لەنێو دیوانی ژنێك لە جنسی باراندا

راسـتە قوبادی جەلیـزادە لەنێـو دیوانی ژنێك لە جنسـی بارانـدا بـە شـێوەیەکی سـەرەکی وێنـەی ژنـی کێشـاوە و پانتاییەکی زۆری لە دیوانەکەی بۆ جەسـتە، کێشـە، هەسـت و نەسـت، لێکچوواندن و.. رەگەزی مێ تەرخانکردووە، بەڵام لـە هێندێك هۆنراوەدا لەخودی خـۆی دوواوە، کە بەهۆیـەوە جـۆری بیرکردنـەوە و ئـارەزوو، خۆزگە و ئاواتـی لای خوێنەر خۆیادەبێـت و لەهەمان کاتدا کەرەسـتەیەکی بەسـوودە، بۆ لێکۆڵینەوە لەو وێنانەی، کە ژنی تێدا بەرجەستەکردوون.

جەلیـزادە لەنێـو ئەم دیوانەیدا دوو وێنـەی دژ بەیەکی بۆ خۆی کێشاوە، کە هێندێکیان ئەرێنین و هێندێکیشیان نەرێنین.

لە پارچە هۆنراوەی (نوێژناکەم. ل. ٦٣٨) دوو وێنەی دژ بەیەکی، کە یەکێکیان وێنەی ئەرێنی و ئەوەی دییان وێنەی نەرێنییە خستۆتە بەردەست ئێمەی خوێنەر، لە وێنە ئەرێنییەکەیدا پێوەندی خۆی لەگەڵ پەپوولە، گوڵی یاسەمین و کەناری روونکردۆتەوە. ، کە هەرسێکیان لەم هۆنراوەیەدا لە رووی تایبەتمەندییەکانیانەوە هێمان بۆ رەگەزی مێ. ئەم دارشتنە لەگەڵ ئەوەی وێنەیەکی ئەرێنییە، لە هەمان کاتدا وێنەیەکی خواستەییشە، کە شائیر، پەپوولە، گوڵی یاسەمین لێ خواستراو و رەگەزی مێش بۆخواستراون.

پەپوولە لای زۆربەی گەلان ئەفسانەی تایبەتی خۆی هەیە، بەلام بەشێوەیەکی گشتی خۆشی و ئاسوودەیی بەخشە. هێمای گەشبینییە و باڵەکانی هەلگری هەواڵی خێر و دڵرفێنن. پەپوولە لای جەلیزادە خۆشەویستی دەژەنێت، شائیریش لە بەرامبەریدا وەك رەنگە رەنگینەکانی وشەی ئالووالا بۆ پەپوولەکەی خۆی دەنەخشێنێت. جەلیزادە لەرووی رەچەڵەکەوە خۆی دەباتەوە سەر پەپوولە (ل. ٩٧) هەڵبەت، ئەگەر پەپوولە لای جەلیزادە هێمای رەگەزی مێ بێت، ئەوا ئەو بە رەچەلەك دەچێتەوە سەر پەپوولە. ئەگەر شائیر لە پەپوولە مەبەستی نواندنی جوانی و خۆشەویستی بێت، چی بە وشە و چی بە رەفتار، لەم بارەشدا هەر دەچێتەوە سەر رەچەڵەکی پەپوولە.

**پەیوەندیم لەگەڵ پەپوولەدا، خۆشه..**

**ئەو،**

**خۆشەویستی دەژەنێ.**

**من،**

**وشه دەنەخشێنم.** (ل. ٦٣٨)

گوڵـی یاسـەمین هێمای نەرم و نیانی و رۆمانسـییەتە، له جوانـی و بۆنخۆشـیدا تایبەتمەنـدی خۆی هەیـە. لەنێو زۆر گەلاندا نێوێکی تایبەتیشـە بۆ رەگـەزی مێ و هەر گەلە و بە پێی تایبەتمەندی فۆنۆتێکی خۆی گۆی دەکات. جەلیزادە لەم هۆنراوەیەدا لە بارەی پێوەندی خۆی و یاسەمین نووسیویەتی:

**له یەك گەرەكدا پەروەردە بووین، من و**

**یاسەمین**

خوێنەر، کە ئەم دێڕە دەخوێنێتەوە، یەکسەر بیری بۆ ئەوە دەچێت، کەیاسـەمین کچێك بووە و لەگەڵ شائیردا پێکەوە پەروەردەبـوون. دوورنییـە لـە ژیانـی شـائیردا مێینەیەکی وا بـەم ناوە هەبووبێت، بەڵام لێرەدا یاسـەمین لێخواسـتراوە بۆ رەگەزی مێ، نیشـانەی خواستنەکەش نەرمونیانی، بۆنخۆشی و سەرچاوەی جوانییە.

کـەناری لەنێو باڵندەکاندا هێمای هێمنی و دەنگخۆشـییە.

بەجۆراوجـۆر و نەخشـینی پەڕوباڵـی نێـوداره. پەلەوەرێكی ماڵییـە، حـەزی لە تەنیایـی نییـە و بەخێوكردنی خۆشـی و ئاسـوودەیی بەخشـە. هەر تەنیـا نێرینەكانیان دەنگخۆشـن چەندیـن ئاواز لەو گەرووە ناسـكەیان دەخولقێنـن. هەر لەم روانگەیـە جەلیـزادە خۆی هێناوەتـە ڕیزی كـەناری، چونكە ئەویش بۆ ڕەگەزی مێ دەچریكێنێت بۆیە دەڵێت :

**من و كەناری،**
**دەرچووی یەك پەیمانگەی هونەرین.**

شـائیر هـەر لەم پارچـە هۆنراوەیـەدا ئەو وێنـە نەرێنییە دەخاتەروو، كە هێندێك كەس بۆیان نەخشاندووە و دەچێتە نێو خانەی بەدرەفتاری و دەنووسێت:




**بێ ئەخلاقی من،**
**هەر ئەوەیە:**
**ژنم خۆشدەوێ.**
**مەی دەنۆشم.**
**نوێژكەر نیم.** (ل. ٦٣٨)

وەڵامـی بوێـژ بـۆ ئەوانـەی بەمجـۆرەی ژووروو هەڵـی دەسـەنگێنن، هەر لـە هەمان پارچـە هۆنراوەدا دەربـڕاوە، کە دەوری خـۆش رەفتاری خـۆی بەرامبەر بە رەگەزی مێ بە هێما بەرجەسـتەدەکات، بەوەی دەسـتی گرتووە، تا نەخلیسـکێت، پاسەوانی سینگو بەرۆکی بووە، کە بە هێشووە ترێ دەیانچوێنێت، تا زەنگەسۆرە تێی نەئاڵێن و کچێنی لەدەست نەدەن.

**دەستی تیشکم گرتووە نەمهێشتووە،**
**لەسەر پشتی شەختە بخلیسکێت.**
**پاسەوانی هێشووە تریم کردووە،**
**نەك زەنگەسۆرە، کچێنی شەقار کەن.** (ل. ٦٣٨)

لـەم چەند دێڕە هۆنـراوەی ژوورووودا وێنەیەکی خواسـتن لامان بەرجەستە دەبێت. تیشك: لێ خواستراوە. رەگەزی مێ: بۆخواستراو. هێشووە ترێ: لێ خواستراو. مەمك: بۆخواستراو.

جەلیـزادە زۆر بـە روونـی تیشـکی لـە شـوێنی رەگەزی مـێ و هێشـووە ترێـی لـە برێتی مەمـك داناوە، بۆیـە وێنە خواستراوەکەی ئاشکرا و روونە.

لە هەر کۆپلەیەکی پارچە هۆنراوەی (نوێژناکەم. ل. ٦٣٨) چەنـد وێنەیـەك پێشـاندراون. وێنـەکان وێنـەی ئەرێنی و نەرێنی و خواسـتن و.. دەگرنە خـۆیان و بنیاتێکی کۆپلەیین و هەریەکەیان تەواوکار و روونکەرەوەی وێنە گشتییەکەن.

## وێنەی وەرزەکانی ساڵ لای جەلیزادە

شـائیر لە پارچە هۆنـراوەی ( ژنێکی بـێ دەرپێیە پایز. ل. ٦٦٠ - ٦٦٢) وێنەیەکـی پایـز دەکێشـێت و لەگەڵیـدا باس لە وەرزەکانی دی سـاڵ دەکات. لەنێو وەرزەکانــدا لە هەرسـێ وەرزی زسـتان، بەهار و هاوین بێـزارە، بۆ هەر یەکەیان هۆی تایبەتـی خۆی هەیە، بەڵام وەرزی پایزی خۆشـدەوێت، نەك لەبـەر ئەوەی پایز تابلۆی فیسـتیڤاڵی رەنگـەکان دەنوێنێت و هەر گەڵایەکی هەڵوەریو سـەربوردەیەکی تایبەتی خۆی هەیە و بـەرەو ژیانێکی نـوێ هەنگاودەنێـت، بەڵکـو لەبەرئەوەی وەرزی خەزانـە، هەڵکردنی رەشـەبای پایزە، کـە لە ئەنجامدا درەختـەکان رووتدەکاتـە، جەلیـزادەش هـەردەم جەسـتەی رووتی رەگەزی مێی لا گەرەکە:



**چاوەڕێم پایز ..**
**رووت رووت،**
**خۆت بدەیتە بەر دووشی باران.**
**جۆگە ئاو،**
**چارشێو و**
**جلك و**
**پێڵاوەکانت.**
**رامالێ و**
**لەنێو گۆمی وروژاندا،**
**نقوومیان کات.** (ل. ٦٦٢ )

جەلیزادە وەنەبێت هەر لە سێ وەرزی ساڵ بێزار بووبێت، بەڵکو لە هەڵسوکەوتی هێندێك کەس وەرەسبووە، کە خۆیان هەڵدەقورتێننە نێو هەموو وردەکارییەکی ژیانی رۆژانەی. شائیر لەو هەموو یاسا و رێسایانە جارسە، کە لەسەر بنەمای داوونەریت هاتوونەتە ئارا و.. ئەمانە و دەیان نموونەی دی، کە لایەنی کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و..دەگرێتە خۆی، لەلای ئەو چتی بێزراو و لەبەرچاوکەوتوون. لەنێو پارچە هۆنراوەی (گوجیلە سەگ. ل. ٢١٦ - ٢١٩) دا، شتە بێزارکراوەکان یەك لەدوای یەك رێزکراوون و شائیریان ئەوەند هەراسانکردووە، خۆزگەی ئەوە بخوازێت ببێت بە سەگ. کەواتە شائیر لەگەڵ

هەبوونی ئازادییەکی رەهایە.

**نە تۆ لە رێکخراوێکی ژناندا، ئێشکت**

**دەگرت و**

**نە من چەکم بۆ حیزب هەڵدەگرت.**

**...**

**خۆزگە من و تۆ سەگ دەبووین.**

**دە وەرە با ببین بە سەگ.** ( ل. ٢١٦ - ٢١٩ )

تۆ بڵێیت راکردن لە ئینسان بوون چارەسەربێت؟ سەگیش ئازاد نییە، هەتا لەو وێنانەدا، کە شـائیر بۆ سـەگی کێشاون و دەڵێت:

**من و تۆ دوو سەگ بوینایە،**

**لە گوندێکدا،**

**لە باخچەیەکی ئاژەڵاندا،**

**لەناو رانە مەڕێکدا**

**پێکەوە دەژیاین**

**...**

هەڵبـەت ئەو گوندە بە رانەمـەڕەوە خاوەنێکی هەر هەیە، سەگەکەش دەکرێت بە پاسـەوانی مەڕەکان. سەگە هەردەم چـاوی لە دەسـتی خاوەنەکەیەتـی، تا ئێسـکێك، نانەرەکێك فڕێ بداتە بەردەمی. سەگیش ئەوەند بە وەفا و بەینەتە، بووە

بـه نموونه، كاتێ دهگوترێت: له سـهگ به وهفـا تره، چونكه هـهردهم لـه راژه و خزمهتـی ئهو كهسـه دایه، كـه بهخێوی دهكات. كهواته له بارهی خۆزگه خواسـتن بۆ بوون به سهگ، دیسـانهوه كهسهكه له چهمك و رهفتار و كردهوهدا، نابێت به بكهرێكی كارا، بهڵكو ههر به بهركار دهمێنێتهوه، یانی ههردهم لهژێر تهزوو و كاریگهری یهكێك، یان هێزێكی دییه.

## وێنهی نهرێنی

بوێـژ لـه دیوانی ژنێـك له جنسـی باران دا لـه كهرهتێك زێتـر دان به خوویـهك (ئهگهرچـی ئهو به خووی ناژمێرێت) دادهنێـت، كهم كهس ههیه وا راسـتگۆیانه لێی بدوێت، كه ئهویـش درۆكردنـه. شـائیر درۆكانی خـۆی له راسـتییهكانی بهرامبهرهكـهی خۆشـتردهوێت، كـهواتا چهمكـی ههسـتی درۆكردنـی بـه چهمكی ههسـتی راسـتكردن گۆریوهتهوه به پاسـاوی ئـهوهی ئهگـهر درۆكانـی نهبن، ئـهوا راسـتییهكانی بهرامبهرهكهی دهیانكوژێت. (درۆكانی خۆم. ل. ٥٢).

**گوتت موستهحیله بگهڕێمهوه...**
**گوتم نا دهگهرێیتهوه!**
**دهمزانی راست دهكهیت،**
**بهڵام من درۆكانی خۆم له راستییهكانی**

**تۆ،**

**خۆشتر دەوێ.**

شـائیر راشـکاوانە پێمـان دەڵێـت درۆدەکـەم. وادیارە تاموچێژێکـی خـۆش لـە درۆکانـی دەچێژێـت، بۆیـە لـە هۆنراوەی لەپێشـوو باسـکراودا درۆکانی خۆی خۆشدەوێت. لـە هۆنراوەیەکـی دیـدا درۆکانی لـەلا لە ماچ شـیرینترە. ئەو کەسانەی شائیر درۆیان لەگەڵدا دەکات پەلیان بۆ ئەندامانی دەرەوەی خێزانیش هاویشـتووە و راسـتورەوان هۆیەکانیشـی خۆیادەکات:

**وێنەی نەرێنی ـ درۆکردن**



...

**درۆکردن،**

**لە ماچی ئەو ژنە شیرینترە**

**کە سەررێژە لە هەنگوین.**

**نەمکردووە بەخۆ..**

**بەڵام گەلێك جار درۆدەکەم** (ل. ٥٤٠)

درۆکردن وشەیەکی فەرهەنگی واتادارە. لای شائیر شیرینە، بەڵام رادەی شیرینێکەی لە ماچ شیرینترە. کەواتا شائیر درۆکردن بەراورد دەکات و لە هەمان کاتدا بە ماچی دەچوێنێت. ماچێك، کە بەرجەستکراوە بە خستنەپاڵی دوو وشەی هاوواتای شیرین و هەنگوین، کەواتا ماچەکە شیرینە و هی ژنێکیشە سەررێژە لە هەنگوین. لێرەدا شائیر بەرێگەی لێکچوواندنەوە وێنەی بەرجەستەکردنەکەی پێکهێناوە.



## دووەم: وێنەی رەگەزی مێ لەنێو ئەندامانی خێزانی جەلیزادە

جەلیزادە لەنێو هۆنراوەکانی دیوانی نێوبراودا چەند وێنەیەکی ئەندامانی رەگەزی مێی خێزانەکەی کێشاوە، لەوانە:

١. وێنەی نەنکی.
٢. وێنەی دایکی.
٣. وێنەی هاوژینی.

ناوەرۆکی وێنەکان بەپێی ژەمان، شوێن، تەمەن، ئەرك و جۆری پێوەندییان، جیاوازییان هەیە و هەر یەکەی مۆرکی تایبەتی خۆی هەڵگرتووە، هەروەك لەم شیکردنەوانەی ژێروو بەرچاودەکەون:

### ١. وێنەی نەنکی

جەلیزادەی شائیر زۆرجار بیری لەسەردەمی منداڵی کردۆتەوە. لەو سەردەمەدا بەزۆری وێنەی ئەندامانی خێزانی هاتۆتەیادی، ئەوانەی سەر بەرەگەزی مێن: نەنك، دایك. کچی دراوسێ و دەوروبەریش پشکێکیان لەم یادەوەرییە بەرکەوتووە.

وێنەی نەنکی جەلیزادە لە وێنە هەرە نایابەکانی

دیوانەکەیەتـی. وێنەیـەك پاك، راسـت، مرۆڤانـە، تـۆی لـە خۆشەویسـتی بۆ خـاك و نیشـتمان. وێنـەی نەنکێك هیچ خەمـی مـاڵ و منـداڵ و نـەوە وپارە و پـوول و زەوی وزار و .. نەبـوو، تاکـە خەمـی خۆراکی رۆژانـە، خەوتـن، گەرما، سـەرما و سـەرکەوتنی پێشـمەرگە دلێرەکانی کوردسـتان بوو، کە لەسـەر بەرماڵ نوێـژی دەکرد، داوای لە خـودا نەدەکرد، کە لە گوناهەکانی خۆشـبێت، کەنەفـت و پەککەوتە نەبێت، بەهەشت بە قسمەتی بێت. نەنکی نزای ئەوەی نەدەکرد، کە منداڵەکانی پایەبەرزبن، دەوڵەمەند بن، ملیاردێربن، بەڵکو:

نەنکم

لەسەر بەرماڵە سپییەکەی،

دوعای دەکرد و دەیفەرموو:

خودایە،

کاتێ پێشمەرگە پشوودەدەن،

هەموو رەوەزێك،

بکەی بە لباد و

هەموو بەردێك بە سەرینی لۆکە (ل. ٢٨٠ )

...

خۆزگە نەنکی منتان دیتبا.

نا دیتووتانە.

**ئەو دەمە لە هەموو ماڵێکدا**

**نەنکێك هەبوو،**

**کە لە نەنکی من بچێت.** (ل. ٢٨٢)

بوێــژ بەرێگەی یادکردنی نەنکی یەکســەر ئەو دیمەنەی، کە زێتر لای ماوەتەوە، هی ئەو کاتە بووە، کە نەنکی لەســەر بەرماڵ بووە، نزای بۆ پێشــمەرگە کردووە. شائیر راست دەکات لەســەردەمی نەنکــی ئــەودا و ئێســتەش رەگــەزی مــێ بــە گشــتی، زۆر بەپیرۆزی و گەورەیی و خۆشەویستی دەڕوانێتە پێشمەرگە.

لــەم پارچــە هۆنراوەیــەی ژووروودا جەلیــزادە وێنەیەکی نوێــی بــۆ نەنکی کێشــاوە، جیاواز لــە وێنەی جــاران، کە بە ترســنۆك و بێدەســەلات وێنا دەکرا. وێنــەی نەنکی جەلیزادە وێنەی ژنێکی نیشــتمانخواز و کوردپەروەر، هاوبیر لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی گیانی خۆیان فیدا کردووە بۆ کوردستان.

بوێــژ هێندێکجــار دیمەنی نەنکی دێتــەوە یاد لەو کاتەدا، لە بن ســێبەری هەیوانی ماڵەوەیاندا دانیشــتووە و چایەکی بە کلۆی قەند خواردۆتەوە ( ل. ١٨٢ ) یان ئەو ساتەی لە خانووە شەرقییەکەیان، نەنکی شەڕواڵەکەی بۆ پینە کردووە ل. ٢٠١



**۲ . وێنەی دایکی**

وێنــەی دایــك لای جەلیــزادە هێندێکجــار ئامادەییەکــی باشــی هەیە. وێنەکان رەنگە رۆژانە دووبارەببنەوە و ئەو کار و کردەوانە لەخۆیان دەگرن، کە مانای خۆشەویســتی و سۆزی پاکی هاوژینێتی و دایکایەتییان لێ دەچۆرێتەوە.

شائیر لە یادکردنی دایکیدا وەسفی هەستپێکراوی دەرەکی دایکی ناکات، وەك رووخساری، چــاوی، برۆی، دەمی کەد و باڵای ، بەڵکــو ناخی جوانی بەرجەســتەدەکات ، کە چۆن لە هەڵسوکەوت و جۆری پێوەندی بە هاوژینی رەنگیداوەتەوە:

**دایکم جەمەدانییە شۆراوەکەی باوکم**
**لەسەر رستی حەوشەکە هەڵبخات** (ل. ۱۸۲)

لــە پارچە هۆنراوەی (دوبەی. ل. ۱۹۸ - ۲۰۲) شــائیر دوورە وڵاتــە. لە خۆشــترین و بەرزتریــن هوتێل دابەزیــوە، کەچی یەکســەر شــاری کۆیــەی دێتەوەیاد. لەنێو شارەکەشــدا بەر لە هەموو کەســێك دایکی، چونکە بۆ ئەو نیشتمانە، ئاسوودەیی ژیانە. لە مێشــك و دڵ و دەروونیدا زۆرجار ئامادەیی هەیە. شائیر لەم هۆنراوەیەدا پشت بە تەکنیکی یادکرنەوە دەبەستێت. شــائیر لە گەرمــاوی ئەو هوتێلــە ٥ ئەســتێرەیە، یادی جۆری خۆشوشــتنی جارانی دەکات و خۆزگە دەخوازێت ئێســتەش

هەر بەهەمان جۆر خۆی بشـوات. ئەم گەرانەوەی بۆ رابردوو وێنەیەکی وەسفی نەستەلژێیە بۆ سەردەمێك و بۆ شوێنێك، کە تێیدا هەستی بە ئارامی ژیان و خۆشەویستی دەوروبەری بۆی دەنوێنێت:

لە بڵندترین نهۆمی هوتێلێکی ٥ ئەستێرە
دابەزیوم
کەچی پێم خۆشە بە هەمان فرۆکە،
هەڵفرمەوە « کۆیە"
بچمەوە ناو خانوێکی شەرقییەوە،
دایکم مەنجەڵێك ئاوم بۆ گەرم کات و
لەسەر شۆرەکەی ، بە سابوونێکی رەقی و
لیفکەیەکی زوورزوور خۆم بشۆم
زرنگەی جام و شڵپە شڵپی ئاو،
بگاتە ئەو دیوی حەوشەکە. (ل. ١٩٩)

جەلیزادە لە پارچە هۆنراوەی ( خودا ل . ١٦٣) وێنەیەکی زۆر نایابـی دایکی کێشـاوە، لەوکاتەدا، کە لەسـەر بەرماڵە و کرنووشـی بۆ خـودای خۆی بردووە و نوێـژ ی کردووە، ئا لەو ئان و ساتە پاك و بێگەردەی نێوان دایکی و خودادا جەلیزادە دەڵێـت: چاوم بە چاوی خـودا کەوت. هەروا لەو کاتەشـدا، کە دایکی تەسـبیحی بەدەسـتەوە بووە، نێوی خودای هێناوە،

جەلیـزادە گوێی لە خشـپەی پێی بـووە. بەڵێ لە سـەردەمی منداڵـی ئەودا پێوەندی نێـوان خودا و مرۆڤ پڕ لە ڕێزلێنان و خۆشەویستی و لەسەر ئەم زەمینەدا بێبەرامبەر بوو.

جارێك

لەسەر بەرماڵەکەی دایکم،

چاوم بە چاوی کەوتووە.

جارێکیشیان،

لەنێوان دوو دەنکە تەسبیحی دەستیدا،

من گوێم لە خشپەی پێی بووە.

وێنـەی دایکـی لەسـەر بەرمـاڵ و تەسـبیح لەدەسـت، وێنەیەکـی فۆتۆگرافییـە، بـەڵام ئـەو دوو کردەیـەی ئەو، کە برێتیـن لە چاوپێکەوتن و گوێ لێبوون، وێنەیەکی هەسـتی بینین و بیستنە، کە شائیر لێزانانە وێنای کردوون.

٣ . وێنەی هاوژینی

لەنێو ئەم دیوانەدا هیچ پارچە هۆنراوەیەك بەرچاوناکەوێت، کـە تایبـەت بـۆ هاوژینەکـەی نووسـرابێت، بەڵام بـە پەرت و بـڵاوی لە ناواخنـی هێندێك هۆنـراوەدا هێمای بـۆ کردووە. وێنـەکان کاری ڕۆژانـەی هاوژینەکـەی پێشـاندەدەن، کـە ئەرکـی سـەرەکی هەڵسـووراندنی ماڵ بە ئەسـتۆی ئەووەیە. لەم وێنانەدا هیچ پێداهەڵگوتنێك، ستایشـێك، دەستخۆشـی

لێکردنێك ، هاوبیرییەك و.. بۆ هاوژینەکەی بەرچاوناکەوێت، بەڵکو هێندێك جار باس لە هێندێك وردەکاری ژیانی رۆژانەی دەکات، کە زۆر تایبەتە بە ژنەوە، پێویست بە باسکردنی ناکات. لە ژێرەوە هێندێك لەم وێنانەی جەلیزادە بۆ خێزانەکەی کێشاونی وەك خۆیان دەخەمەروو:

لەوانەیە ژنەکەم، لە بورجی خەلیفە
بکەوێتە خوارەو و هەپروون بە هەپروون
بێت (ل. ١٨٦)

ژنەکەم سێ کەڵەشێری کوردی خستۆتە
سەر ئاگر و تەشتێك برنجی شۆشتۆتەوە. (ل. ٢٠٧)

فەزاکە زۆۆۆر سنووردارە، باڵکۆنێك و
دوو کورسی و سێ ئینجانەی وەریو،
کە ژنەکەم بیری دەچێت، ئاویان بدات. (ل. ٢٥٨)

ژنەکەم لە هۆڵەکە، گوێ لە ئەلقەی
٩١٠ درامایەکی بێزارکەری تورکی
دەگرێت.
کە تیایدا، ژنێکی دەوڵەمەند، کوڕێکی
خوێری خۆشەوێ (ل. ٣٤٤)

بۆ زیاتر بەرچاوروونی لەو وێنانەی، کە جەلیزادە، هاوژینەکەی تێدا بەرجەستەکردوون ئەم دوو هێڵکارییەی ژێروو دەخەمە بەردەست، کە تیایاندا رادەی پێوەندی و جۆری بیرکردنەوەی نێوان جەلیزادە و هاوژینەکەی خراونەتەروو:

**وێنەی یەکەم**

وێنەی جۆری پێوەندی نێوان




**ژنەکەم،**

**لە مدبەقەکە،**

**بەدەم قونچك کردنی بامیەوە،**

**گۆرانی دەڵێ.**

**من،**

**شیعر بۆ ژنێك دەنووسم..**

**ماڵیان لە گەرەکێکی ترە.** (ل.٢٣٥)

دوو دنیـای لێك دوور و نامـۆ. دڵنیام لەوەی هاوژینەکەی باش دەزانێـت، کـە جەلیـزادە ژنێکـی لـە گەرەکێکـی دی، کردووە بە کەرەسـتەیەکی بەپیتی پارچـە هۆنراوەیەك، چونکە لـەلای ئێمە هەموو جۆرە کارێك بۆ ڕەگەزی نێر ڕەوایە، بەڵام ئـایا جەلیزادە ڕێگە بـە هاوژینەکەی دەدات، کـە گۆرانی بۆ نێرینەك غەیری ئەو بڵێت، هەروەکو چۆن ئەو شیئر بۆ ژنێك لە گەرەکێکی دی دەهۆنێتەوە؟

وەنەبێـت هـەر لای جەلیـزادە وێنەی نەرێنـی هاوژین کێشـرابێت، بەڵکـو لای هێندێـك شـائیرانی دی هاوچـەرخ بەرچاودەکەون، بۆ وێنە بڕوانە: (بڕوانە : ناز کاکەیی ٢٠١٧ و ئەورەحمان فەرهادی ٢٠١٧)



**وێنەی دووەم**


وێنەی جۆری بیرکردنەوەی
جەلیزادە ------- و -------- هاوژینی
لەسەر پشت پاڵکەوتوون
لەشیان بەر یەکتر ناکەوێت
چاویان بریوەتە بن میچ
بیردەکەنەوە
شـــائیر دەزانێت، کە ژنەکەی بیر لەمانە دەکاتەوە:
ژەمی خواردنی سبەی
پارەی ئاووکارەبا
سەردانی بەرگدروو
کڕینی سەوزە و میوە ودەرمان و ...
شائیریش بیردەکاتەوە،
بەڵام ژنەکەی نازانێت لە چی؟

ئـەم هێڵکارییـەی ژووروو، لەبـەر ڕۆشـنایی ناوەڕۆکـی پارچـە هۆنـراوەی ( تا پەنجـەرە بـە خەبەر دێـت ٢١٢ - ٢١٤) نەخشـاندووە، کـە وێنەیەکـە، دەکرێـت ناوی نامۆیـی لـێ بنێیت و ئەم لێکدانەوەیەش هەڵدەگرێت:

١.جەلیزادە دەڵێت: دەزانـم (ژنەکەم) بیر لەچی دەکاتەوە. شائیر یەك لیستی دوورودرێژ لەو ئەرکانەی ریزکردووە، کە بە بۆچوونـی ئەو، ژنەکەی بۆ بەیانی ئەنجامیان دەدات، کەواتە لێرەدا شـائیر لەو کاتەدا، کە لە تەنیشـت خێزانەکەی لەسەر پشـت پاڵکەوتووە و ئەو کاتەش، کـە هۆنراوەکەی هۆنیوەتەوە هـەر بیری لە ژنەکەی کردۆتەوە، بەڵام لای ئەو نەیدرکاندووە. جەلیـزادە ئەوەند باوەڕی بە ژنەکەی هەیە، لێی نەپرسـیوە بیر لە چـی دەکەیتەوە؟ بەڵکـو زنجیرەیەك کاری بـۆ هۆنیوەتەوە. لەوانەیـە ژنەش هەر بیری لە جەلیزادە کردبێتەوە، ئەو پرسـە گەورەی لا دروستبووبێت بۆ جەلیزادە وا هێور و بێدەنگە؟

٢.جەلیزادە دەڵێت ژنەکەم نازانێت من بیر لەچی دەکەمەوە؟

لەبـەر ڕۆشـنایی ناوەڕۆکـی زۆربـەی هۆنراوەکانـی نێـو ئـەم دیوانـە، ژنەکـەی باش دەزانێـت، کـە جەلیـزادە چاوەڕێـی وەدەستخسـتنی هەوێنـی شـیئرێکی نوێیـە، کە لـە بەخەبەرهاتنـی پەنجەرەکانـەوە بۆی دێـت. ، بۆیە ژنە بە ئاسـوودەیی دەخەوێت و پرخەی دێـت و ئەویش لە دنیای بیرکردنەوە بەجێدەهێڵێت.

**ئەو پرخەی دێ**

**من هەر بیردەکەمەوە...**

**تا پەنجەرەکان بە خەبەردێن**

**بیردەکەمەوە.**

**بەڵام ئەو**

**نازانێت**

**من بیر لە چی دەکەمەوە** (ل. ٢١٥)



## سێیەم: وێنەی رەگەزی مێ لە دەرەوەی خێزانی جەلیزادە

جەلیزادە چەند وێنەیەکی بۆ رەگەزی مێ لە دەرەوەی خێزانی خۆی کێشاوە، کە بایەخێکی تایبەتییان هەبووە لەلای. ئەم وێنانە لەو سەردەمەی ئێستادا بەرچاون، بەڵام هێندێکیان ئەوەند نەبوونەتە ناوەرۆکی بەرهەمی بیری رەگەزی نێر، لەوانە: پێشمەرگەی رەگەزی مێ، قەیرە کچ (گەورە کچ) و لەشفرۆش.

### ١ ـ وێنەی پێشمەرگەی رەگەزی مێ

لە دەستپێکی پارچە هۆنراوەی (خوایە چەند جوانە

ئـەو بەرگـە. ل. ٧١١ ـــ ٧١٣) جەلیزادە وێنـەی کچێکمان بۆ دەکێشێت، کە ئاشتیخوازە، بەڵام ناحەزەکەی باوەڕی بە ئاشتی و مافـی گەلان نییە، تەنێ شـارەزای زمانی شـەڕە، بۆیـە هەر لەسەر ڕەوتی جارانی خۆی سوپای مەرگی خستۆتەسەر. کچە ناچارەبێـت، کە پەنا بۆ چەك بەرێت و ببێت بە پێشـمەرگە و جلوبەرگی گەریلا بپۆشێت. جەلیزادە پاشتر دوو وێنەی دژ بەیەکی ئەم کچە گەریلایەمان بۆ دەکێشـێت، هەروەك لەم هێڵکارییەی ژێروو پێشاندراوە:

**وێنەی کچێك پێش بوونی بە گەریـلا**

**بایەخی دەدا بـە:**




ئیدی ڕەنـــگ ناکـــەم نینۆکـــم
بــــۆن و عەتــر نادەم لە خۆم.
لە شـــەوی ئەنـگوستە چـــاوا،
هەر دە پەنجەم دەکەم بە مۆم (ل. ٧١٢)

**وێنەی هەمان کچ پاش بوونی بە گەریلا**




**جانتام پڕ دەکەم لە فیشەك**
**لە جێی ماکیاج و ماسکارە**
**رووباری خوێنم دەبەخشم،**
**بـــە گوڵاڵەی ئـەم بـەهـارە** (ل.٧١٢)

لەگـەڵ گۆرانـی شـیرازەی ژیان لـە زۆر لاوە. خەباتـی شۆرشـگێرانەی کوردیـش گۆرانـی بەسـەرداهات. جـاران تێکۆشـانی چەکـداری هەر لە ئەسـتۆی پیاواندا بـوو.. ئەمڕۆ چـۆن ئایدیۆلۆژییـا و کەرەسـتەی خەباتکـردن گـۆران، بەمجـۆرەش تێڕوانینـی ئافرەتـی کورد بۆ خەباتـی چەکداری کورد گۆڕانی بەسـەرداهات، ئیتر نایەوێت، هەر بەرکار و بەر کاریگـەری کـردەوەی رەگەزی نێر بکەوێـت و بێوەژن بێت، یان سـێوی. نەخێـر رێگەیەکی پیـرۆزی هەڵبـژارد، ئەویش بوونی بە پێشـمەرگە. جەلیزادە لە پارچـە هۆنراوەی ( ئابڕووی ژنیشـە نیشـتمان. ل. ٦٩٦) زۆر بەجوانی ئەم ئەرکە تازەیەی

ئافرەتی کورد دەخاتـەروو، هەروەك لەم هێڵکارییەی ژێرەوەدا بەرجەستەکراوە:

**دوو وێنەی دی دژ بەیەکی کچێکی گەریلای**







**٢ ـ وێنەی کچێك لە قوربانییانی کارەساتی ئەنفال**

پارچە هۆنراوەی (زارا. ل. ٦٩٤) لەو هۆنراوە کارتێکەرانەیە، کە جەلیزادە بۆ رەگەزی مێی نووسـیوە. ئەو قوربانییانەی هێژ کـورد هەر چاوەڕێـی گەڕانەوەیانـن لە بیابانەکانی باشـووری عیراقـەوە. جەلیـزادە لەم هۆنراوەیـەدا باس لە ئاوی سـازگار، هاشـەی چـەم، قووقەی کەڵەشـێر، بانگدانی مەلا، شـلپەی مەشـکەو ...ی کوردسـتان دەکات، کـە هـەر هەمـوویان ژیاونەتەوە. جا تابلۆیەکی نایاب بۆ یادکردنی زارای قوربانی لە لایەن دارودەوەنی هەوارگەکەی بۆ دەکێشـێت، هەروەك لەم

هێڵکارییەدا بەرچاودەکەوێت:

**وێنەی یادکردنی زارای قوربانی ئەنفال**




جەلیزادە هەر لەم پارچە هۆنراوەیەدا یەکسەر لەدوای تابلۆی یادکردنی زارا دا، بە وشە رەنگینەکانی و بەدارشتنە کورت و پڕ ماناکانی تابلۆیەکی دیمان بۆ دەکێشێت، کە تابلۆی چاوەڕوانییە و ئامادەکردنی ئەو کەرەستانەی لە شارەوە و کڕیویانە و هێناویانە بۆ دێ:

**لە شار**
**جام و شانە**
**گۆزەی تازەمان بۆ کڕیوی**
**کەی دێیتەوە:**
**بێتاقەت نەبووی لە عەرعەر!** (ل.٦٩٥)

**٣ ـ وێنەی رفێندراوانی رەگەزی مێ لە کارەساتی شەنگال**

کاتــێ مــرۆڤ دووچــاری ناخۆشــییەك، یان نەهامەتییەك دەبێت، بۆ زاڵبوون بەسەریدا و راهیکردنی، هیچ دەسەڵاتێکی نابێــت، روو لــە یەزدانــی مــەزن دەکات. هــەروەك لە پارچە هۆنراوەی (خودا. ل. ٤٩٤) ی جەلیزادە بەرچاودەکەوێت.

جەلیزادە ڕوو لە خودا دەکات و دەڵێت: خودا ئێمە داوای دڵۆپێك باران، لەتە نانێك، بوراقی باڵدار و ساباتی شانشینت لێ ناکەین. جەلیزادە هەموو داواکارییەکانی لە خودای خۆی، تەنێ لە مانەوەی مرۆڤایەتی کورد کورتکردۆتەوە، هەروەك لەم هێڵکارییەدا ڕوونکراونەتەوە




کاتێ لە سەرەتای مانگی ئابی ساڵی ٢٠١٤ دا چەکدارانی دڕندە و ڕەشی داعش هێرشیان کردە سەر شەنگال بە هەزاران ئافرەتی شەنگالیان دەستبەسەرکرد و کردیانن بە سەبایا.

سـەبایا: ئـەو ئافرەتانەن، کە لـە کاتی جەنگـدا دەکەونە دەسـتی موسـڵمانان. زۆرجـار خاوەنەکانیـان زۆر نامرۆڤانـە ڕەفتـاریان لەگەڵـدا دەکـەن، لە دەسـتدرێژیکردن بۆ سـەر نامـووس، تا دەگاتـە ڕادەی بازرگانـی پێکـردن، هـەروەك لە چیرۆکی دڵتەزێنی ئەو کچ و ژنانەی شـەنگال، کە لە داعش ڕزگارکراون دەبیستین.

هـەر لەبارەی کارەسـاتی جەرگبـڕی شـەنگال، لە پارچە

هۆنـراوەی (کۆکردنـەوەی ئاگـر. ل. ٥٠٤) دا ئـەم کۆپلـە هۆنراوەیەی نووسیوە:

کەمێك رووندك،
لە چاوی ژنە رفێنراوەکانی شنگال
خڕدەکەمەوە و
دەیدەمەوە بە باران

## چوارەم: وێنەی باری جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی

لەنێـو دیوانی ژنێك لە جنسـی باران دا جەلیزادە تیشـك دەخاتە سـەر چەنـد بارێکی کۆمەلایەتی، کـە بەلای ئەوەوە گرنگن و لە چەند وێنەیەکدا بەرجەسـتەیان دەکات، لەوانە: ژن کوشتن، قەیرەکچ، لەشفرۆش.

### ١. ژن کوشتن

ژن کوشتن لەنێو کۆمەڵی ئێمەدا بووە بە دیاردە، هەرچەندە رێکخراوانی کۆمەڵی مەدەنی بەرێگەی هۆشیارکردنی هەردوو رەگـەزی نێـر و مـێ، هەوڵـی بنبڕکردنـی دەدەن، بـەڵام ژن کوشتن هەر بەردەوامە. رەگەزی نێر لەنێو جڤاکی کوردەواریـدا ئـەو مافەی بەخـۆی داوە، کە نێزیـکترین کەسـی خۆی، کە خوشك، هاوژین، یان کچێتی بەنێوی ئاوڕوو لەنێو بەرێت.

هەتا ئێستا توێژینەوەیەکی راستینە نەکراوە، بۆ لێکۆڵینەوە

لـە هـۆی کوشـتنی رەگـەزی مـێ بـە دەسـتی نێرینەیەکی ماڵـەوەیان. چونکـە لەگـەڵ لەنێـو بردنیدا هـەردەم رەگەزی مێینەکە لەکەدارکراوە و هۆی تاوانەکەی خراوەتە ئەستۆ. هۆی سـەرەکی بۆ لەنێوبردنی، رەنگە هەر رەگەزی نێرینەی ماڵەوە بێت، بەڵام راشکاوانە لەم بارە نەکۆڵدراوەتەوە.

جەلــیزادە لەنێو چەنـد پارچە هۆنراوەیەکـدا هێما بۆ ژن کوشــتن کردووە. بــۆ وێنە لە هۆنــراوەی ( تــرس. ل. ٣٨) دا بەزاری رەگەزێکی مێ قسەی کردووە و دەڵێت:

**پیاوێك تەقەم لێ دەکات**

**تەقەم لێ دەکات پیاوێك**

جەلیــزادە هەر لــەم هۆنراوەیەدا و هەر بـە زاری رەگەزی مێینەوە، پەیڤەکانی ئاراستەی رەگەزی نێر کردووە:

**لەسەر تۆیە، کە دەمکوژن، نەك لەسەر**

**نیشتمان**

کەواتە ژن بە دەسـتی رەگەزێکی نێرەوە دەکوژرێت، هەر لەسـەر رەگەزێکـی نێر. دوو نێر شـەڕیان لە سـەر مێیەکە، نەك پێکەوە هەوڵی ئازادکردنی نیشتمان بدەن، کە بەرێگەی سـەربەخۆیی نیشتمانەوە دەکرێت، دەیان یاسا دابڕێژرێت، بۆ پاراستنی ژن.

شـائیر لە پارچە هۆنراوەی ( بێ شـەرەفی لەسـەر من. ل.

٢٩٢ و ٢٩٣) ناوی ئـەو کەرەسـتانە دەبات، کـە بۆ لەنێوبردنی ئافـرەت لەلایەن پیـاوەوە بەکاردێت، لەوانە: بـەرد، هەروەك چۆن دوعای پێ شـەهید کرا، تەور، شمشێر و.. جەلیزادە لەم هۆنراوەیەدا بێشەرەفی دەخاتە سەر رەگەزی نێر، چونکە ئەوە زۆرجار بەزۆری، بە هەڵخەڵەتاندن، بە قسـەی شـیرین، یان هەر رێگەیەکی دی دەست بۆ سەر نامووسی کچ درێژدەکات و لـە ئەنجامـدا کچەکـە دەبێت بـە قوربانی بێشـەرەفی ئەو پیاوەی شەرەفی برد.

**وەرە با ،**

**پاکیزەیی لاقەبکەین،**

**بێ شەرەفی لەسەر من** (ل. ٢٩٣)

لەپاڵ باری ژن کوشـتندا، خۆکوشتنیش هەیە، کە بەزۆری ژن بەدەسـتی خۆی، خۆی لەناو دەبات، جا چی بە رێگەی خـۆ سـووتاندن، یان خـۆ خنکاندنـەوە دەبێـت، کـە ئەوەی دووەمیـان ژن و پیـاو پـەنای بۆ دەبـەن. جەلیـزادە لە پارچە هۆنـراوەی (خۆکوشـتن. ل. ٥٠) کەرەسـتەکانی خۆکوشـتنی دەستنیشانکردووە:



### ٢ . گەورەکچ (قەیرەکچ)

گەورەکچی لە ئەنجامی ئەو کارەساتە نەبڕاوانەی یەک لەدوای یەکەی بەسەر ئێمەی کورددا هاتووە، سەریهەڵداوە، چونکە کارەساتەکان بوون بە مایەی لەنێوچوونی یان سەرهەڵگرتنی رەگەزی نێر. رەگەزی مێی کۆمەڵی کوردەواری بە گشتی وا پەروەردەکراوە، کە هەر دەبێت ژیانی خێزانی لەگەڵ کوردێکدا دابمەزرێنێت، بەڵام لە بەرامبەر دا پیاوی کورد بۆی هەیە لە هەر نەتەوە و لە هەر دینێکیش بێت خێزان پێکبهێنێت، ئەمە بووە بە مایەی مانەوەی رەگەزی مێ. جەلیزادە لابەلا لە چەند هۆنراوەیەکدا هێمایان بۆ دەکات:

**کە تاریک دادێ، قەیرە کچێک،**
**پەنجەرەی ژوورەکەی دەکاتەوە و**
**گۆرانییەکی غەمگین دەڵێ.** (ل. ٢٧٦)

لە پارچە هۆنراوەیەکی دیدا، کە لە رۆژی لە دایکبوونی لاسی کچەزایەوە هۆنیویەتێوە، کۆمەڵێک وێنەی کێشاوە، یەکێکیان بەر قەیرە کچێک کەوتووە:

**.. دەرگەی ئەسانسێرەکە**
**کرایەوە، دڵنیام کچە قەیرەکەی**
**دراوسێمانە، بە چەند عەللاگەیەک میوەوە**
**گەراوەتەوە لە بازاڕ** (ل.٢٠٦)

**بنێشت بە کچە قەیرەکانی دارتوو**
**دەفرۆشێت،**
**دارەبەن.** (ل. ٢٢٨)

**٣. لەشفرۆش**

لەشفرۆشی دیاردەیەکی کۆنە. لە کۆمەڵی ئێمەدا زۆر بە چاوێکی نزم سەیری لەشفرۆش دەکرێت و پیشەکەی وەك کردەیەکی بێ رەوشتی هەڵدەسەنگێندرێت، چونکە دەچێتە نێو چوارچێوەی بەدرەوشتی و کاری نایاسایی. زۆرجار لەشفرۆش دووچاری زیندانی دەبێت لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، ئەوە لەوبارەدا ئەگەر لەلایەن نێزیکترین کەسییەوە بەردەباران و زیندەبەچاڵنەکرابێت.

لە هێندێك وڵاتاندا لەشفرۆش لەنێو چوارچێوەی یاسادا مافی پارێزراوە، هەردەم لەژێر چاودێری تەندروستی دایە و ژمارەی سەئاتەکانی کارکردنی سنووردارکراوە، بەواتا وەك هەر کارێکی ئاسایی دی سەیرکراوە.

لای ئێمە کردەی لەشفرۆشی بە شێوەیەکی نهێنی هەیە. زۆرجار لەبەر هەر هۆیەك بێت، چاوپۆشی لێدەکرێت و هێندێکجاریش بەنێوی بەدرەوشتی لەشفرۆشان دەستگیر دەکرێن و سزای زیندانیان بەسەر دادەسەپێندرێت. لەدوای

ئازادکردنیان دیسانەوە دەگەڕێنەوە سەر کاروپیشەی خۆیان، چونکە هیچ لایەك نییە، لەکاتی بەندکردنیاندا هۆی بوونیان بە لەشفرۆش چارەسەربکات و سەرلەنوێ ئامادەیان بکات بۆ تێکەڵبوون بە کۆمەڵ.

هەبوونی کاری لەشفرۆشی بەم شێوەیە، زیان بە تەندروستی لەشفرۆش و ئەوانەی پێوەندیشی پێوەدەکەن دەگەیەنێت و هەروا کێشەی کۆمەڵایەتیشی لێ دەکەوێتەوە.

جەلیزادە لەچەند پارچە هۆنراوە و لە چەند دێڕێکدا باس لە دیاردەی لەشفرۆشی کردووە. هێندێکجار هاوخەمی خۆی بەرامبەریان نواندووە، بۆ وێنە لە سەرەتای پارچە هۆنراوەی (لەشفرۆش. ل. ٦٤٣ - ٦٤٥) جەلیزادە دەڵێت:

**بۆنی هەزاران پیاوت لێ دەکەم**

جەلیزادە لەنێو ئەو هەزاران پیاوانە، پیشەی ٤٠ جۆرە پیاوی تۆمارکردووە. ئەم پیاوانە ئەوەند سەردانی لەشفرۆشەکەیان کردووە، بۆنی ئەوانی گرتووە. بوێژ فیتەر، قەساب، بازرگان و.. تا دەگاتە موختاری گەڕەك، دادوەر، ڕۆماننووس و پەرلەمەنتار و... خستۆتە نێو لیستی ئەو کەسانەی پێوەندییان پێوەی هەیە.

شائیر لەم هۆنراوەیەدا دوو توخمی دژ بە یەکی خستۆتەڕوو:

یەکەمیان: لەشفرۆش بۆنی هەزاران پیاوی لێ دێت، چونکە جەستەی خۆی تەرخانکردووە بۆ چەند توێژێك لە

کۆمەڵ، تا بەختەوەری و خۆشی جەستەیان پێ ببەخشێت.

دووەمیان: لەشفرۆش بۆنی هەموو پاکییەك و جوانییەکی لێ دێت، کاتێك دەڵێت:

**بۆنی هەموو شتێکت لێ دەکەم..**

**بۆنی گوڵ**

**بۆنی پەپوولە**

**بۆنی پاکیزەیی**

کەواتە بە رێگەی ئەم دوو توخمەوە ململانێیەك لەخودی لەشفرۆشەکەدا خراوەتەروو، کە دوو رەگەزی دژ بە یەکی لەشفرۆشتن و پاکی دەنوێنن. مەبەستی شائیر لەمەدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئەم لەشفرۆشە لە ناخیدا پاکە، بەڵام رۆژگار ئەوی گەیاندۆتە ئەم بارە سەختەی، کە خۆشی بە هەموو خەڵك ببەخشێت، کەچی خودی خۆی لەگەڵ ئەو بەخشینەیدا رۆژبەرۆژ بەرەو پووچبوونەوە هەنگاوبنێت.

جەلیزادە لە کۆتایی هۆنراوەکەیدا سەرسام دەبێت و دەگاتە پۆپەی ئەو بارە تراژیدییایەی ژیانی زۆربەی لەشفرۆشان کۆتایی پێدێت و پرسیارێکی گەورە ئاراستەی ئەو ژنە دەکات، کە لەزەت بە هەزاران پیاو دەبەخشێت، دەڵێت:

**ئەی بۆ بەردەبارانت دەکەین؟!**

**ئەزیزم** (ل.٦٤٥)

لە راستیدا دەبا جەلیزادە:

- ئەم پرسیارەی لەم پیاوانە کردبا، کە جەستەی لەشفرۆش بـۆ لەزەتی خۆیان بەکاردێنن و خۆشـی لە ئـازاری روحی ئەو دەبینن.

لـە پارچە هۆنراوەی (قەحپـە. ل. ١٣٦) جەلیزادە بەراوردێك لەنێوان چێژفرۆشێك و وەتەنفرۆشێك دەکات. بە بیروبۆچوونی جەلیـزادە ئـەو پوولـەی چێژفـرۆش دەسـتی دەخـات، لـە کاروکـردەوەی چاکەدا سـەرفی دەکات، بۆ وێنە دەیبەخشـێتە دایکی، کوڕی، ئەو پیاوەی گەوادی بۆ دەکات، بە خوێندکارێکی هەتیو، بە مشـتێك گەنم بۆ چۆلەکە، بە فیشەکێك بۆ پێشمەرگە و بە مندالآنی کوبانێ و پیرەمێردانی شنگال. لە بەرامبەردا ئەم وێنەیەی، کە لـەم هێلکارییەدا روونکراوەتـەوە بۆ وەتەنفرۆش کێشاوە:




لـە پارچـە هۆنـراوەی (پێڵاوێکی چـەرم. ل. ٥٣٤ - ٥٣٥) شائیر هێندێك وێنەی بۆ ئەو کوڕە هەژارانە کێشاوە، کە لەبەر گرِی بەتینی هەتاو هەڵقرچاون، لە سەرماوسـۆڵەی زستانیشدا سەرمابردووبوون، سەرباری ئەمەش، کە بە شەکەتی دەگەڕێنە

ماڵـەوە دایکوباوکێکـی پەککەوتـە چاوەڕێیانـن و.. کەواتـە ئامانجی شـائیر لە پێشـاندانی ئەم وێنەیـەدا پەردەهەڵماڵینە لەسەر ئەو جەوروستەم و جۆری چەوسانەوەی ڕۆژانەی ئەم توێژە هەژارە دەیچێژن. شـائیر ئۆباڵی سەرهەڵدان و هەبوونی ئەم بارە بۆ هیچ لایەنێك ناگێڕێتەوە، هەروەك شائیرانی نیوەی یەکەمی سەدەی ڕابردوو هێمایان بۆ دەکرد و پابەندییان دەکرد بە نەبوونی دادوەری لە دابەشـکردنی سـەروەت و سـامان و دەسـەڵاتی وڵاتدا. جەلیزادە بەمجۆرە سەرمایەی کوڕی هەژار دەخاتەروو:

**وێنەی سەرمایەی کوڕە هەژار**




دوای ئـەوەی جەلیـزادە وێنـەی نەداری بۆ کـوڕی هەژار دەکێشـێت، کە وێنەی مرۆڤێکە بێبەشـە لەهەمـوو مافێکی مرۆیی. شائیر بیر لە دوو لایەنی ژیانی توێژی هەژار دەکاتەوە و هەوڵی چارەسەرکردنیشیان دەدات.

## یەکەم: چێژی جەستەیی کوڕی هەژار

جەلیـزادە بەرێگـەی تییـان وا لـە ژنـی لەشـفرۆش دەگەیەنێت، کە لەگەڵ کوڕی هەژاردا بنوێت، چونکە ئەگەر خۆی لەشفرۆشـبا هـەر لەگەڵ گەنجی کرێکاردا دەنوسـت و

لەزەتی بەسەدا دەباراند!

**لە بن دیواری قوڕ و**

**لە سایەی تروسکایی چرایەکی کوێردا**

**جەستەیان شەلال دەکەم. لە بارانی**

**لەزەت.**

**دووەم: چاککردنی باری دارایی کوڕە هەژار**

جەلیزادە هەر بەوە نەوەستاوە، کە لەشفرۆش بێبەرامبەر چێژ بە کوڕە هەژار ببەخشێت، بەڵکو بیری لە پارە و پوولی ئەو ژنە لەشفرۆشە کردۆتەوە و دیسانەوە بەرێگەیەکی ناڕاستەوخۆ داوای لێ دەکات، کە بەشێك لە پارە و پوولی خۆی لە بن سەرینەکانیان دابنێت، تا پێداویستی خۆیان پێ دابین بکەن:

**بەشێك لە گیرفانم دەخەمە بن سەرینە**

**شڕەکانیان.**

**تا شووشەیەك دەرمان و**

**قەمسەڵەیەکی خوری و**

**پێڵاوێکی چەرمی پێ بکڕن.** ل. ٥٣٥

لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان خستۆتەروو، کە زۆربەی هەرەزۆری لەشفرۆشەکان لەبەر هەژاری روویان لە فرۆشتنی جەستەی خۆیان کردووە. جەلیزادە لەنێو هەموو توێژەکانی کۆمەڵدا تەنێ لەشفرۆشی بە کەسێکی مەرد، ئازا،

نانبـده، لەزەتبەخـش و.. داناوە، بۆ ئـەوەی بەرێگەی ئەوەوە چارەسەری نەداری رەگەزی نێر بکات. کەواتە شائیر بە دید و تێڕوانینێکی زۆر جیاواز و لەنێو کۆمەڵدا نەخوازراو دەخاتەروو بـۆ چارەکردنی هـەژاری. لە بەرامبەر ئـەوەدا چاوەڕێدەکرا لە شـائیر، داوای ژیانێکی سرەوتانەی دوور لە جەستەفرۆشتن بۆ لەشفرۆشان کردبا. نەك نەداری بە لەشفرۆشتن چارەسەرکردبا.



## پێـنـجـەم: وێنەی رەگەزی مێ بە گشتی

لای هێندێك شـائیر رەگـەزی مێ هەر ئـەو رەگەزە نییە، کـە پێوەسـتە پێیـەوە و گیـرۆدەی بـووە و بـۆی نالوێت لێی دووبکەوێتەوە. رادەی هۆشـیاری شائیر فراوانتر و بەرئاوەڵەترە لەوەی هەر بە جەستەی ژندا هەڵبڵێت، کاتێك وێنەی گشتی ژنمان بۆ دەنەخشـێنێت، کە لایەنـی کۆمەڵایەتی، ئابووری و رۆشنبیری توانایی بەرجەستەدەکات.

جەلیـزادەی بوێـژ لـە پارچـە هۆنـراوەی (ژن. ل. ٥٢٦) وێنەیەکـی ژن دەکێشـێت، کە جیاوازە لە هەمـوو وێنەکانی دی. ناوەرۆکی ئەم هۆنراوەیە تەرخانکراوە بۆ هێز و توانای ژن، هەڵبـەت نەك لە رووی توانای جەسـتەیی، بەڵکو لە لایەنی بیرمەنـدی و ژیری و لێهاتوویی، چونکـە هەر خاوەن هزری پاك دەتوانێـت ئـەم کردەوانـە ئەنجامبـدات، کـە لەنێو ئەم هێڵکارییەدا روونکراونەتەوە:



**هەر بە تۆ دەكرێ**
**دووپشك بكەی بە پەپوولە.**
**بەرسێلە پڕ كەی لە هەنگوین**
**قەتماغە ببەخشیتە برین.**
**ئاگر چەك بكەیت و شەڕ بوەستێنیت.**
**لانە چێكەیتەوە بۆ ئەڤین**
**هەر بە تۆ دەكری** (ل. ٥٢٦)

شائیران لەنێو هۆنراوەكانیاندا زۆرجار باڵندەكانیان كردووە، بە هاوبەشی خەمیان، خۆشیان، نامەبەریان و .. كۆتر یەكێكە لەو باڵندانەی بۆ مەبەستێك زێتر لەنێو هۆنراوەی كوردیدا ناوی هاتووە. كۆتر بە نسكە و ناڵین و میهرەوانی هەروا نەرمی و باریكی هێمای بۆ كراوە. جەلیزادە لە پارچە هۆنراوەی (فریادرەس. ل.٤٦١ و ٤٦٢) ناوی كۆتر دەبات وەك هێمایەك بۆ ئاشتی، چونكە وا باوە، كۆتری سپی نیشانەی ئاشتەواییە. شائیر ژنی بەو هێزە بەهێزە بەو داخوازكاری ئاشتییە پێشانداوە، كە لە كۆتر بە تواناترە بۆ بەرپاكردنی ئاشتی و كۆتایی هێنان بە شەڕ:

**كۆتر،**
**هیچی لە دەست نەهات،**
**هەر درێژەی هەیە شەڕ.**

**وەرە تۆ فریادرەسمان بە،**

**ئەی ژن.** (ل.٤٦٢)

شائیر لە هێندێك هۆنراوەی دیدا هەر باس لە گەوهەری ڕەگەزی مێ دەكات بەگشتی. هۆنراوەی (ژنێك لە جنسی ئاو. ل. ٤٦٥ - ٤٦٩) دا كۆمەڵێك وێنە دەنوێنێت، بەڵام سەرجەم وێنەكان تێكڕا یەك مەبەست دەگەیەنن، كە ئەویش ژنە و ئەو ژنەش وەك ئاو تەنكە، تەڕ و لووسە، بۆی ناگیرێت، یان تریفە و ڕووناكی چلچرایە بە هیچ جۆرێك بۆی كۆناكرێتەوە:




...

**كە ماچم كردیت،**

**ئیتر كەس نەیناسیمەوە.**

**لە بیبانەوە،**

**بووم بە هەور.**

...

**دوای هەموو ژوانێكی تۆ،**

**ماڵەکەم دەگوێزمەوە باخ،**

**ئاخر،**

**دەبم بە درەخت.** (ل.٤٦٧)

له پاڵ ئەمانەشدا هەموو جەلیزادە دیسانەوە بە شێوەیەکی گشتی لە ژن دواوە، بەڵام ئەمجارەیان لەوباری جووڵە، هەروەك لەم هێڵكارییەدا دیارە:




**ئەو ژنە**

**کە بەپێوەیە، درەختە.**

**...کە رێدەکا، شنەی عەتر.**

**کە دادەنیشێ، بنکەگوڵ**

**کە رادەکشێ، رووباری شیر.** (ل.١٤٢)

## شەشەم: وێنەی رەگەزی مێ لە دنیای خۆشەویستی جەلیزادەدا

بابەتی خۆشەویستی لای جەلیزادە و زۆربەی هۆنەرانی دی پێوەندێکی بەتینی بە ئافرەتەوە هەیە. شائیر هەوڵیداوە لەنێو ئەو هۆنراوانەی دەچنە نێو ئەم باسەوە، ئازادانە رای خۆی دەرببڕێت. لەنێو فەرهەنگی وشەکانیدا ئەم پەیڤانە هەڵبژێرێت، کە دنیایەك بێنێتە ئارا خۆشەویستییەکی بێسنوور و بێ بەربەست و رەها رەنگبداتەوە.

وا دیارە جەلیزادە لە بەرنامەی ژیانیدا نەبووە، کە گیرۆدەی هیچ کەسێك بێت، یانی نەیویستووە ببێت بە ئاشق، کەچی دووچاری ئەشق بووە. لەئەنجامی ئاشقبوونیشدا هیچ ئارەزووی نەکردووە لە ئەشق جودابێتەوە:

**شتێك،**

**کە هەرگیز نەمدەویست تووشی بم**

**عەشق بوو**

**شتێك،**

**کە قەت قەت نامەوێ لێم جودابێتەوە**

**عەشقە.** (ل.٧٠٤)

ئەم چەند دێرەی ژووروو دوو وێنەی دژ بە یەکی گرتۆتە

خۆی. وێنەی یەکەمیان نەویستنی ڕووداني تووشبوونی به ئەشقه.وێنەی دووەمیان لەدایکبوونی ڕووداوه نەخوازراوەکەی وێنەی یەکەمه ، بەڵام لەوەیاندا نایەوێت هەرگیز له ئەشق جودابێتەوە.

دووچاربوونی شائیر به داوی خۆشەویستی و گەیشتن به پلەی ئاشقبوون، ئەوەند کاریگەری دەبێت، ئەویش وەك شائیرانی پێش خۆی خۆزگەی ئەوە بخوازێت لێی نێزیکببێتەوه و هەردەم لەبەر چاوی بێت، هەتا لەو بارانەشدا، که کتێبی دەخوێندەوە:

خۆزگه کتێب پەنجەره دەبوو
هەرکه دەمکردەوە،
تۆم تیا ئەدی. (ل.٣٦٩)

شائیر وێنەیەکمان بۆ دەکێشێت، که بەر هەستی بینین دەکەوێت، بەڵام لێرەدا دووجۆره بینین خۆیان دەنوێنن: یەکەمیان بینینی نووسراوی نێو کتێب، کاتێك ، که دەیکاتەوە. دووەمیان: بینینی ئەو کەسەی خۆشی دەوێت. هێندێك ئاشق هەردەم خۆشەویستەکەیان لەبەر چاوه، هەتا لەنێوان دێری نووسراویشدا بەدی دەکەن، بەڵام شائیر ئەوەی تێدەپەڕێنێت، ئارەزوو دەکات، کتێبەکەی پەنجەره با و یەکسەر خۆشەویستەکەی تێدا بەرجەسته کردبا.

جەلیزادە ئەمجارەیان هەستی بیستن بەرجەستەدەکات. پێکەنین و پشکوتن بە یەك دەچوێنێت. پێکەنین کردەیەکی مرۆییە و پشکوتنیش کردەیەکی سروشتییە، جەلیزادە لە هەردوویان وێنەیەکی زیندوو دەکێشێت:

**گوێم لە سرتەسرتی پشکوتنی گوڵەکانە:**

**کە پێدەکەنیت.** (ل. ٣٧٢)

هێندێکجار کەسی ئاشق دەیانجار بیردەکاتەوە، چی بە خۆشەویستەکەی بڵێت، کاتێك دەیبینێت. جەلیزادە لەنێو ئەو شتانەی، کە دەیەوێت لای بیدرکێنێت، ئەمەیانە:

**زۆر شت هەن، پێتی بڵێم**

**بۆ نموونە**

**خۆشمدەوێی** (ل.٣٧٣)

پارچە هۆنراوەی (سپیدە. ل. ٩٦٣) ئەوە بەرجەستەدەکات، کە خۆشەویستی کاریگەری ئەرێنی لەسەر باری جەلیزادە هەبووە، بۆیە شەوورۆژی لێ بووە بەرۆژ، بەتایبەتی کاتی سەرلەبەیانی:

**بە ئێوارەم گوت،**

**بەیانیت باش.**

**پێکەنی..**

**+ ئاخر ئەو نازانێت**

**لەوەتەی تۆم خۆشویستووە**

**هەموو کاتەکانی من،**

**سپیدەن.** (ل.٦٩٣)

جەلیــزادە لە پارچە هۆنــراوەی ژنێك لە وەزارەتی بەرگری کاروپیشەی ٣٦ ژن هەڵدەدات، کە هەر هەموویان خۆشیان دەوێــت! ژنــەکان کاری جۆراوجــۆریان هەیــە، لەوانــە: لــە وەزارەتــی بەرگــری، لە دادگــە لە یەکێتی ژنان، لــە تۆمارگەی خانووبــەرە، لــە بانــك، لــە بەڕێوەبەرایەتــی ڕۆشــنبیری و.. کاردەکەن. ئەو ژنانەی خۆشــیاندەوێت، هــەر چوار پارچەی کوردستانی لە خۆگرتووە، رۆژئاوا، رۆژهەڵات، باکوور و باشوور، جەلیــزادە لەبیــری نەچووە، هەتا ئــەو ژنەی لــە فرۆکەدایە و لەناو هەورەکاندا سەفەردەکات، هێمایەکی بۆ بکات. ژنەکان لــەرووی ئابوورییــەوە دارا و نــەدارن، لــەرووی کارەوە کارا و بێــکارن. ژنی ماڵ و کارمەندیشــیان تێدا هەیە. ئەو ژنانەشــی بێبەش نەکردووە، کە بە نهێنی نووکەیەکی بۆ دەکەن و هەروا ئەوانەی لە هاوژیانەکانیان بێزارن. ل. ١٩٠ - ١٩٢

ئــەم ٣٦ ژنــەی جەلیــزادە بە وشــە وێنــەی بۆ کێشــاون، زۆربەی توێژەکانی کۆمەڵ لە رەگەزی مێ لە خۆی دەگرێت، هەر هەموویان خۆشیان دەوێت، بەڵام با بزانین جەلیزادە چ جۆرە ژنێکی خۆشــدەوێت، ئایا هیچ کام لــەم ٣٦ ژنە دەچنە

نێو ئـەو چوارچێوەیەی، کە وێنەی خۆشەویستەکەی خۆی تێدا چەسپاندووە؟




شـائیر لـە پارچـە هۆنـراوەی (پیرەمێـرد. ل. ٣٥١) وێنەی بەردەوامبووی دنیای خۆشەویستی دەکێشێت، لەم وێنەیەدا خۆشەویسـتی خـۆی بەرامبـەر بـە ڕەگەزی مێ بەرجەسـتە ناکات، بەڵکـو وێنــەی ئـەو ژنەمان دەخاتە بەردەسـت، کە چـۆن گیـرۆدەی دەبێت و پویتــەی پێـدەدات و خزمەتێکی لەرادەبـەدەری دەکات، هەتا لـەدوای دوامالاواییکردنیشـیدا هەر یادی دەکات:

بەرەبەیانێك دەمرم...
کراسێکی سووری خۆی دەکا بە کفن.
لەنێوان مەمکەکانیدا، دەمنێژێت.
شیعرە پەرش و بڵاوەکانم خڕدەکاتەوە.
لە دوو تۆی بەرگێکدا، چاپیان دەکات.

**و**

**ناوی دەنێ،**

**( ئاوا مەبە ئەی خۆر!)** (ل.٣٥١)

جەلیزادە لە نوێنەرایەتیکردنی دەربڕینی دەنگ، ڕەنگ، هەست و نەستی ژنـدا بۆ خودی خۆی (شـائیر) هـەر بەردەوامە و بە دڵنیاییەوە وێنەی بۆ دەکێشێت، هەروەك لەم هێڵکارییەی ژێرەوەدا دیارە:




**ژنێك،**

**پرچە سپییەکەمی خۆشدەوێ،**

**تاڵ تاڵی لە پەنجە لووسەکانی خۆی**

**دەئاڵێنێت و**

**ماچی دەکات.** (ل. ١٢٥ ـ ١٢٦)

شـائیر لـە پارچـە هۆنـراوەی (تـرێ. ل. ٣٢٨) دا ئـەوە دەدرکێنێـت، کـە مـرۆ لـەدوای مردنیشـی لـەم گەردوونەدا

هەبوونـی هەر دەمێنێت، بـەڵام لە بارێکی دیـدا، بۆیە وای بـۆ دەچێـت، کـە دەبێت بـە داری مێـو. کەواتە لـەم پارچە هۆنراوەیەدا شائیر سـیفەتی مرۆیی بە داری مێو دەبەخشێت و سـیفەتی خۆی وەك مرۆڤێك خسـتۆتە سەر داری مێو، یانی کردوویە بە کەس.

لەلایەکـی دییـەوە پێوەندی خۆی بە ئافـرەتان بەرێگەی پێدانـی سـیفەتی مرۆیی بـە دار بەرجەسـتەدەکات. شـائیر دەیەوێـت ئەوە بڵێـت، کە من هـەتا ئەگەر ببم بە بەشـێك لەم سروشـتە، ئەوا ژن لەژێر سـایەم پشوودەدات. خۆشی لە هەبوونم دەنۆشێت و سوود لە بەرهەمم دەبینێت.لێرەدا دەوری بەمجۆرەی لەم هێڵکارییەدا دیارە، دەخاتەروو:




خۆشەویسـتی هەر لەو بارە ئەرێنییـەی نامێنێت، بەڵکو رەشـەبای لێکترازان و لێك دوورخستنەوە روویان تێدەکات و شـائیر هەسـت بە مایەپووچبوونی دڵداری دەکات. بێئومێدی دەیگەیەنێـت بـە هەوڵـدان بـۆ خـۆ لەناوبـردن بـە چەنـد رێگەیەکی سـەیر، هەرووەك لـە پارچە هۆنـراوەی (کەرەتێك

بــه نارنجــۆك. ل. ٤٢١) دا باســیان دەكات، لەوانــە: خواردنی دەرمانی مێشــككوژ، بە كۆســەرەی ئاسنگەر، بە ماشینەوە خۆ هەڵدێـران و.. جا لەوەتــەی ئەم ژنەی خۆشویســتووە، دەیان جــار هەوڵیداوە بــەم ڕێگایانەی لــەم هێڵكارییەی خوارەوەدا هاتووە خۆی بكوژێت:




شــائیر لەم پارچە هۆنراوەیەدا لە كێشانی وێنەی بێئومێدی و لەنێوچوونی بەهای خۆشەویســتی ڕاستینە، هەر بەردەوامە و لــە تەكنیكێكی دی خۆلەناوبردن دەگەڕێت، كە ئەمیان بە دەســتی خۆی نەبێت، بەڵكو بە دەســت ژنێكی لەشفرۆش و سەرخۆشــەوە بێت. لەم وێنەیەدا بــە لەنێوچوونی خۆی دوو ژن گوناهبار دەكات:

**گەرەكمە ئەم جارە شیرینتر خۆ بكوژم ..**
**دەمانچەیەك دەدەمە دەست، قەحپەیەكی**
**سەرخۆش و**
**تكای لێدەكەم تەقەم لێ بكات.** (ل. ٤٢٢)

شــائیر ئەوەند گیــرۆدەی ژنــە، بۆیــە ئــارەزوودەكات، كە لەنێوچوونیشی بەدەستی ژن بێت، لەم بارەدا دوو ئافرەت بێ

ویستی خۆیان دووچاری خۆکوشتنی ئەو دەبن:

**یەکەمیان:** ئەو ژنەی خۆشی دەوێت، کە بە ئاوڕ لێنەدانەوەی، شائیری بەرادەیەك بێئومێد و خەمۆکی و بێدەسەڵات کردووە، گەیاندوویەتە ئەندازەی خۆ کوشتن.

**دووەمیان:** ئەو ژنە لەشفرۆش و سەرخۆشەی دەمانچەیەکی دەداتە دەستی، تا تەقەیەکی لێ بکات و لەناوی بەرێت، بیکات بە پیاو کوژ، چونکە لە زۆر باردا لەشفرۆشی و سەرخۆشی، مرۆ دەگەێنێتە مرۆکوژیش.

ئەو خۆشەویستییەی جەلیزادە لەبەرامبەر ژن دەینوێنێت، ئەو خۆشەویستییە رۆمانسییەی جاران نییە، کە هەست و سۆزی لەنێو ئەندێشەیەکی بەرفراواندا دەبزوانـد، بەڵکو رەنگدانەوەی ئەزموونی ژیانی هاوچەرخی خۆیەتی. بۆیە وشەی فەرهەنگی شیئری و وێنەکانیشی سەردەمی خۆی دەنوێنن.

لەم هێڵکارییەی خوارەوەدا شائیر وێنەیەکی جەستەیی، تێکەڵ بە هەستی خۆشەویستی کردووە:



**من پێیەکانتم،**

**لە دەست و پەنجەکانت**

**خۆشتر دەوێ.** (ل.١٧٦)



## هـەوتـەم: وێنەی باران و جەستەی رەگەزی مێ

جەلیـزادە لەنێـو ئەم دیوانەیـدا زۆر باسـی باران دەکات، نەك لەبەر ئەوەی وەك دیاردەیەکی سروشت سرنجی راکێشاوە و چێـژی لێ وەرگرتـووە، یان لەبەرئەوەی خۆشـی لەو دڵۆپـە بارانانە بینیوە، کە بەر جەستەی کەوتوون و رووخساریان سوور هەڵگەرانـدووە. هەروا نەك لەبەرئەوەی گوێی لەو سـمفۆنیایە گرتـووە، کاتـێ تنۆکەکانـی باران بـەر پەنجـەرەی ژوورەکەی کەوتوون، بەڵکو ئەو لەو بارەدا بارانی بە میز چوواندووە:

**پۆل پۆل هەور تێدەپەرن**

**کە دەگەنە بەر پەنجەرەکە پانتۆڵەکانیان**

**دادەکەنن و میزدەکەن** (ل. ١٩٨)

لـە پارچـە هۆنراوەیەکـی دیـدا جەلیـزادە هـەر لـە بواری لێکچواندنـدا وێنەیەکـی زۆر جیـاواز لـەوەی پێشـوو بەرجەستەکردووە، یاری بە باران چوواندووە:

**باران نییە، ئەوە تۆی،**

تك، تك و
نمە، نمە
دەباریت،
ئەی یارترین یار. (ل. ٧٢)

جەلیزادە ئەوەندە خۆی لـە باران نێزیـككردۆتەوە، ئەوەند تێكـەڵاوی بووە، گەیشـتۆتە بیرۆكەی ئـەوەی دەبا ناوی باران بووبا، نەك قوباد، چونكە قوباد كوڕی هەورە:

دەبوایە ناوم «باران» بوایە نەك «قوباد»
ئـاخر لە رەچـەڵەكـدا، ئەمـن كـوڕی هەورم! (ل.٥١١)

كەرەتێك تۆ بووی بە هەتاو و
من بە سێبەر،
وەلێ لەپڕ باران دایكرد و
تێكەڵی كردین (ل. ٤٨٢)

وێنـەی باران دەكێشـێت، نـەك لەبـەر ئـەوەی وەكو ژن مایـەی پیـت، هـات، ئەفراندن و مایـەی خۆشـگوزەرانییە، بەڵكـو هەر لەبەر ئەوەی باران رووتە و جەلیزادەش شـێت و شەیدای جەستەی رووتی ژنە.

هەر جارێك دەنگت دەبستم،
تەڕتەڕ دەبم،
تۆ ژنێكی لە جنسی باران (ل. ٤٨٥)

**مەبەستی لە لەزەتی جنسە:**

**کزەبا.**

**وڕوژا هەور،**

**دەرپێکەی داکەند و**

**دڵۆپ**

**دڵۆپ**

**بارانی لەزەتی**

**ڕژاندە سەر سمتی باخ** (ل.٦٦٩)



## هەشتەم: وێنەی جەستەی ڕەگەزی مێ

خۆشەویستی لای جەلیزادە بواری گفتوگۆی ڕۆحی بڕیوە و چووە بۆ نێو قۆناخی گفتوگۆی جەستەیی. ژن وەك بووکەشووشەیەکی بێ هەست و نەستی لێهاتووە. هیچ بۆن و بەرامەیەکی خۆشەویستی لێ ناپرژێت، چونکە جەلیزادە سنووری پێداهەڵدانی ئاسایی و دڵداری بڕیوە و بەنێوی خۆشەویستییەوە پێوەندییە نهێنییەکانی جەستەیی درکاندووە، جەستەی ئافرەتی بە تایبەتی مەمکی بە ئارەزووی خۆی کردووە بە ئامانج و بەبێ هیچ سانسۆرێك لە هەر بۆنەیەکی بۆی لوا بێت خستوویەتە نێو تێکستی هۆنراوەکانی خۆی.




هۆنراوەکانی جەلیزادە تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە، کە لەنێو بوێژانی سەردەمی خۆی جیاوازی دەکاتەوە. زۆربەی هۆنراوەکانی وەك چەند تابلۆیەك وان، کە جەستەی ژن بە ڕووتی بەرجەستەدەکەن. ئەم جۆرە هۆنینەوە لای هەڵبەستوانانی هاوچەرخی خۆی کەمتر بەرچاودەکەوێت.

لەنێو هۆنراوەی کوردیدا بەتایبەتی فۆلکلۆری، زۆر ناوی مەمك هاتووە، بە چەند میوەیەکی وەك سێو، لیمۆ، نارنج، بێ، هەنار و.. چوواندراوە. ئێستەش ڕۆژانە تاکی ئێمە بەو گۆرانیانە مێشکی زاخاوەدرێت، کە بەسەر جوانی جەستەی ژن هەڵدەڵێن و مەمکی ئافرەتانیش پێشەنگی پێدا هەڵگوتنەکەیە. هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە مەمك دیارترین و لەبەرچاوترین ئەندامی جەستەیە.

لەگەڵ ئەوەی مەمك سەرچاوەی بەخشینی ژیانە بۆ کۆرپەی ساوا، لە هەمان کاتدا هەر ئەم ساوایە لە گەورەبوونیدا، هەر بەیادی سەردەمی منداڵی، خۆشی لە مەمك دەنۆشێت، کە دەتوانیت دیسانەوە ناوی بەخشینی ژیانی لێ بنێیت، بەڵام

بە تام و چێژ و هەست و نەستێکی جیاواز.

لەنێو ئەو هۆنراوانەی جەلیزادە، کە بە جەستەی ئافرەتدا هەڵدەڵێت، بەشێوەیەکی سرنجراکێش هێما بۆ مەمك دەکات. دوورنییە ئامادەیی مەمك لەنێو هۆنراوەکانیدا هەر تەنێ حەز و خۆشەویستی و چێژوەرگرتن لەو بەشە جوانەی جەستەی رەگەزی مێ نەبێت، بەڵکو لە ناخەوە سۆزێکی گەرانەوەی بۆ سەردەمی منداڵیدا تێدا هەبێت، هەر بۆیەیە ئەو هەموو وێنانەی بۆ باخی سێوانی ژنان نەخشاندووە.

جەلیزادە لە وێچوواندنەکانی مەمك لەگەڵ ئەوانەی پێشووی خۆیدا جیاوازی هەیە. رەنگە بگوترێت جەلیزادەش وەك ئەوانەی پێشوو لە هێندێك شوێندا مەمکی بە سێو چوواندبێت، بەڵێ راستە، بەڵام لەمەشدا جیاوازییەکی دیار لە بەکارهێنانیدا هەیە، چونکە کە باس لە سێوی بەهەشت دەکرێت، کە بەهۆیەوە هەواو ئادەم لە بەهەشت دەردەکرێن، هەر دەڵێن سێوی هەوا، کەچی جەلیزادە، ئەم فرێزە ساوە و باوە بەکارناهێنێت و هەوای لێ دووردەخاتەوە و بە سێوی ئادەمی نێودەبات، هەتا ئەگەر مەبەستی شائیر ئەوە بووبێت، کە خاوەنی سێوی رەگەزی مێ هەر ئادەمە:




بوێژ لە بەرجەستەکردنی باخی سێوانی ڕەگەزی مێدا، ئاوڕ لەو کەرەستەیەش دەداتەوە، کە پێوەندی ڕاستەوخۆی پێوەی هەیە، وەك سوتیان، کە ئەویش هەر وەك مەمك لە زۆر هۆنراوەدا هێمای بۆ دەکات. جەلیزادە زۆر وەستایانە سوتیانی لەگەڵ وشەی شیئر ڕێکخستووە و بۆ ئەم بارە مەزراندوویەتی، هەروەك دەڵێت:

**ستیانی شیئرێکم دانەکەند و..** (ل. ٤٣١)

یان خستوویەتە نێو پەیڤەکان و لاپەڕەکانی کتێب:

...

**کەچی جاجار زویر دەبوویت**

**ستیانی پەیڤەکانت دەبەست و**

**دوگمەی لاپەڕەکانت دادەخست.** ( ل.٤٨٣)

شائیر لە هەموو بارێکدا بایەخی بە سوتیان داوە، بە لەبەرکردن، بە تەڕی و هەڵواسینی لەسەر تەناف و.. ڕەنگەکانی سوتیان زۆر سەرنجی شائیری ڕاکێشاوە، بۆیە زۆرجار لەگەڵ باسکردنیدا ڕەنگەکەشی خستۆتەپاڵ:

**وێنەی ڕەنگەکانی سوتیان**




ئەو هەموو پێداهەڵگوتنەی جەلیزادە بە سوتیانی ژنان، ئایا دەگاتە ڕادەی هەستکردن بە بۆن و بزواندنی بەرامبەرەکەی، هەروەك لەم دێڕە هۆنراوە فۆلکلۆرییەی ژێرەوەدا هاتووە:

خۆم بە خوڵامی سوخمەی کۆنی

وەك مێخەکبەند دەڕوات بـۆنی



## نـۆیـەم: وێنەی خۆیاکردنی پێوەندی نهێنی لەگەڵ ڕەگەزی مێ

جەلیـزادە زۆر ڕاشـکاوانە ئامـاژە بۆ دۆخێـك دەکات، کە هـەتا ئێسـتا هیچ شـائیرێکی پێش خـۆی لێی نـەدواوە. ئەو دۆخـەی ئەو هێمای بۆ دەکات، لەنێو کۆمەڵدا هەیە، بەڵام بە شـێوەیەکی زۆر نهێنی. جەلیزادە لەنێو ئەم دیوانەیدا چەندین جار پێوەندی ڕەگەزی نێر بە ژنی مێرددار دەخاتەڕوو.

هەڵبەت شائیرانی پێش جەلیزادەش بەو بارەدا تێپەڕیون، بـەڵام ئەوان خـۆیان نەکردووە بە بکـەری ڕووداوەکە، ئەگەر شیئیرێکیشـیان پێدا هەڵگوتبێت، ئەوە بە یار، خۆشەویست،

دڵدار و.. نێویان بردووە.

پێوەندی شـائیر بەو جۆرە ژنانە، گەیشـتۆتە رادەی ئەوەی چاوەڕێبـکات، کە لە ماڵی خـۆی نەمرێت، بەڵکو لە ژووری نوستنی ژنێك، کە بە فەرمی ژنی ئەو نییە:

**من لە ماڵێك لاردەبمەوە، ماڵی پیاوێکی**

**ترە.**

**لە ژووری نوستنی ژنێك دەمرم،**

**لە قۆخێکی گەییو دەچێت.**

**ولا تدری نفس بأی أرض تموت** (ل.٤٦)

جەلیـزادە زۆرباش دەزانێـت، کـە ئـەم جـۆرە پێوەندییە نائاسـاییە، کارێکـی ترسـناکە و ئەنجامێکـی باشـی لـێ ناکەوێتەوە، بۆیـە دەڵێت:

**تۆ هی پیاوێکی تری، من هی ژنێکی تر.**

**من مینێك، لەبەردەم ماڵەکەتاندا، دەچێنم.**

**تۆش لەبەردەم ماڵەکەی مندا،**

**لوغمێك** (ل. ٥٣)

شـائیر لـە کۆپلەیەکـدا بـە زاری ژن قسـەدەکات، کە لە ماڵەوە کەشوهەوایەکی لەباری هەیە، بۆئەوەی پێکەوەبن:

**وەرە هەر ئێستا وەرە**

**تەنیام**

**مێردەکەم چۆتە گورجیا.**

**منداڵەکانم سەفەریانکردووە بۆ**

**کەنارەکانی ئەنتالیا** (ل. ٢٠٣)

لە وێنەیەکی دیدا جەلیزادە بارێك دەخاتەروو، کە پێوەندی رەگەزی نێر و ژنی مێرددار ئەوەند پتەوە، کاریگەری لەسەر هەڵسوکەوت و رەفتاریشی کردووە، بۆ وێنە مەشرووبی پێ قەدەغە کردووە. هەر بەوەش نەوەستاوە، کە خۆی خزاندۆتە نێو ژیانی خێزانی ژن و مێردێك، بەڵکو سنووری بەزاندووە بەوەی، کە شەرِی بە مێردەکەشی فرۆشتووە:

**چاکت کرد مەشروبت پێ تەرك کردم..**

**دەنا هەموو شەوانی مەستی،**

**دەستم لەسەر زەنگی ماڵەکەتان،**

**هەڵنەدەگرت.**

**شەرِم بە مێردەکەت دەفرۆشت.** (ل.٥٢٣)

من وای بۆ دەچم، جەلیزادە لەم وێنانەی پێوەندی نێوان هەر پیاوێك و ژنێکی خێزانداردا بەرجەستەدەکات، دەیەوێت راشکاوانە پەردە لەسەر ئەو پێوەندییە نهێنییە لابدات، کە دەمێکە هەیە و هیچ شائیرێك نەیویستووە، یان پێی نەنگ و شەرم بووە، لێی بدوێت، ئەگەرچی لەنێو هۆنراوەی فۆلکلۆریدا بە ئاشکرا دەربراوە.

جەلیزادە لەپاڵ ئەمانەدا دەیەوێت، ئەمانەی ژێروو بخاتەروو:

١: ئەم دۆخەی ئەم ژن و مێردانە تێیکەوتوون، لە ئەنجامی ئەوەیە، کە زمانێکی هاوبەش و لێك تێگەیشتن هەردوو هاوژین کۆناکاتەوە.

٢: هێندێك جار لەگەڵ سەرهەڵدانی ناکۆکی و ناتەبایی و بەرفراوانبوونی دنیای نامۆیی نێوان ژن و مێرد، هەر یەکەیان بیر لە کەسێك دەکەنەوە، تا ئەم بۆشاییەیان بۆ پڕبکاتەوە.

٣: هیچ پێوەندییەکی ئەوتۆ لەنێوان شائیر و ژنانی خێزاندار دا نییە، ئەگەرچی لە هەندێك باردا خۆی کردووە بە بکەری ڕووداوەکان، بەڵکو تاکە مەبەستی جەلیزادە ئەوەیە پێمان بڵێت ئەم جۆرە خێزانە ناکۆکانەش لەنێو کۆمەڵی ئێمەدا هەن، کە هەر لە ڕووکەش خێزاندارن، بەڵام لە ڕاستیدا ناکۆکن و لە دنیایەکی نامۆدا دەژین.

٤: جەلیزادە دەیەوێت بەو ژنە خێزاندارانە بڵێت: لەگەڵ ئەوەی هاوژینەکانتان نرختان نازانن، ئەوا کەسانێك هەن هەست بە نامۆیی ئێوە دەکەن و بیرتان لێدەکەنەوە، هەروەك لەم کۆپلەیەی ژێرەوەدا هێمای بۆ دەکات و لە هەمان کاتدا وێنەیەکی نەرێنی دوو هاوژین دەخاتەڕوو:

...

کەچی لە ژوورەوە

لە قەراخ ڕووباری هەنگوینا،

**پیاوێکی گەمژە،**

**لە ئێوارەوە پرخەی دێ.**

**دێیتە بەر پەنجەرە، دەڕوانیتە باران،**

**لەناو هەموو دڵۆپێکدا،**

**شائرێکی سەر سپی دەبینی،**

**شیعر بۆ چاوە مەستەکانت دەنووسێت.** (ل.٦٩١)

**وێنەی نەرێنی نێوان دوو هاوژین**




لـە پاڵ درکاندنی ئەم هەموو پێوەندییـە نهێنییانەی نێوان هەردوو رەگەزی نێر و مێ، جەلیزادە دەگاتە ئەنجامی ئەوەی، ئەم رەفتارە بخاتە نێو خانەی گەمژەیی:

....

**ئەوپەڕی گەمژەییشە،**

**کە تـۆ، ژنێکت خۆشبوێ،**

**کە ژنی تۆ نییە.** (ل.١٨١)



# ئەنجام

١ . وێنەی رەگەزی مێ لەنێو دیوانی ژنێك لە جنسی بارانی قوبادی جەلیزادەدا هەر تەنێ وێنەی جەستەی ژن نییە، هەروەك شائیر پێی ناسراوە، بەڵكو وێنەكان هەمەجۆرن، لەوانە: نەنك، دایك، هاوژین، پێشمەرگەی رەگەزی مێ، ئافرەتانی قوربانییانی ئەنفال و رفێندراوانی كارەساتی شەنگال. لە بابەتە كۆمەلایەتییەكانیش، ژن كوشتن، قەیرە كچ (گەورەكچ) ، لەشفرۆش و ...

٢. وێنەی نەنكی لەپاڵ ئەوەی گەرانەوەیەكە بۆ سۆزی خۆشەویستی ئەو، لە هەمان كاتدا هێندێك پەسنی جوانی دی خستۆتەسەر جۆری بیركردنەوەی نەنكی، كاتێك وەك نیشتمانخوازێك بەرجەستەی كردووە.

٣. لە باسكردنی دایكیدا پشتی بە تەكنیكی یادكرنەوە بەستووە، بۆ كەسێك، شوێنێك و كاتێك، كە تێیدا هەستی بە ئارامی و خۆشەویستی كردووە. راستە لای زۆربەی شائیران دایك هێمای زێد و نیشتمانە، لای جەلیزادە لە پاڵ ئەمانەشدا بە وەبیرهێنانەوەی هەستی بیستن و بینینی سەردەمی منداڵی وەك دوو كردەی لەبیر نەكراو هاتۆتەوە یاد.

٤. لەنێو هەموو وێنەكاندا، بۆنی بۆندارترین خۆشەویستی، سۆزی پاكی هاوژینێتی و دایكایەتی و مرۆڤدۆستی بەزۆری

لە وێنەی دایکیدا هەست پێدەکرێت، تا ئەو دەیان وێنانەی بۆ ئافرەتانی دی کێشاونی.

٥. وێنەکانی هاوژینی پەرت و بڵاون لە ناواخنی هێندێك هۆنراوەدا هێمای بۆکردوون. لەم وێنانەدا هیچ پێداهەڵگوتنێك، ستایشێك، دەستخۆشی لێکردنێك، لێکنێزیکییەك، هاوبیرییەك و.. بۆ هاوژینەکەی بەرچاوناکەوێت، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بابەتێکی نوێی شیعری کوردییە، کە لای هێندێك شائیرانی هاوچەرخدا بەرچاودەکەوێت.

٦. جەلیزادە ئەرکی تازەی ئافرەتی کوردی بە شانازییەوە خۆیاکردووە، کە ئەویش بوونی بە پێشمەرگە، بۆ بەرگریکردن لە خاك و نیشتمان. کەواتە وێنەی پێشووی ئافرەتی کوردی وەك کچە شەهید، ژنە شەهید و سێوی و.. نەنەخشاندووە، بەڵکو ئەرکە نوێیەکانی زێتر بەرجەستەکردووە.

٧. قوربانییانی ئەنفال و رفێندراوانی کارەساتی شەنگال، نەك لە رووی ئەوەی بێدەسەڵاتییان پێشان داوە، بەڵکو لەرێگەی وێنەی ئەوانەوە زوڵم و رەفتارە نامرۆییانەی داگیرکارانی کوردی خستۆتەڕوو.

٨. چەند وێنەیەکی باری کۆمەڵایەتی ژنی کورد لە سەردەمی ئەمڕۆدا وەك: ژن کوشتن، گەورە کچ و لەشفرۆش زۆر بوێرانە باسیان لێوە کراوە.

٩. لەم دیوانەدا بایەخی تەواو بە هزر، ژیر، توانا و لێهاتووی ئافرەتی کورد دراوە، ، لە لایەنی چارەسەرکردنی کێشە و ناکۆکییەکانی نێو جڤاکدا وێنەی بەرچاوی بۆ کێشراوە.

١٠. لە وێنەی رەگەزی مێی ـ خۆشەویست، دنیایەکی خەملیو لە دڵداریێتی و هەژ و ئەڤینی هەست پێ ناکرێت، بەڵام لە بەرامبەردا وێنەکان ئەوەمان بۆ دەخەنەڕوو، کە شائیر شەیدای رەگەزی مێیە.

١١. هەوڵدراوە وێنەکانی نێو دیوانەکە بە زمانێکی وێژەیی بنووسرێت، زمانێك تایبەت بە خودی شائیر بێت.

١٢. لە کێشانی وێنەی هونەریدا بایەخ بە رەوانبێژی دراوە، بە تایبەتی لە لایەنی لێکچوواندن، خواستن و لە هێندێك باریشدا بە تەنکردن و بیستن و بینینیشدا.



## سەرچاوە

١ـ د. سەردار ئەحمەد حەسەن بەکر، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیئری کوردی دا ١٩٧٠ ـ ١٩٩١ سلێمانی ٢٠٠٤

٢ـ م. د. فوزیە لعیوس غازی الجابری، المرأە فی شعر مظفر النواب (دراسە فنیە و موضوعیە)، مجلە القادسیە فی الاداب والعلوم التربویە، المجلد (٨) العدد (٣) ٢٠٠٩

٣ـ د. هالە العبوشی، دراسە أسلوبیە فی شعر الحب عند نزار قبانی، مجلە جسور المعرفە، العدد (٦) . ص ( ١١٤ ـ ١٣٠) ٢٠١٥

٤ـ کوردستان موکریانی، ئاستی زمان لەنێو هۆنراوەکانی حەمەسەعید حەسەن دا، گۆڤاری قەڵای زانست، ژمارە ٤، بەرگی ٢ ژمارە ٤ ئابی ٢٠١٧ لاپەڕە ١ ـ ١٣.

٥ـ ناز فەلەکەددین کاکەیی، هاوسەفەر، هەولێر ٢٠١٧

٦ـ ئەورەحمان فەرهادی، چۆڕاوی تریفە، هەولێر ٢٠١٧

٧ـ کوردستان موکریانی، وێنەی رەگەزی مێ لەنێو هۆنراوەی کوردیدا، گۆڤاری قەڵای زانست، ژمارە ٦، ٢٠١٨

٨ـ کوردستان موکریانی، بکەری رەگەزی مێ لەنێو چۆڕاوی تریفەی فەرهادیدا، رۆژنامەی هەولێر، ژمارە ٢٧٢١ ، ٢٠١٧/١٠/٦

٩ـ کوردستان موکریانی، وێنەی رەگەزی نێر لەنێو

هۆنراوەکانی ناز کاکەییدا. گۆڤاری قەڵای زانست، لەژێر چاپ دایە

١٠ـ کوردستان موکریانی، وێنەی رەگەزی مێ لەنێو هۆنراوەکانی نیگار نادردا، گۆڤاری قەڵای زانست، لەژێر چاپ دایە

١١ـ قوبادی جەلیزادە، ژنێك لە جنسی باران، سلێمانی ، چاپی یەکەم ٢٠١٩



# بەرهەمە چاپکراوەکانی دانەر

کتێب :

1 . Е. и. Кедайтене, Курдистан Мукриани. учебный Русско - Курдский Словарь. Москва 1977

فەرهەنگی رووسی ـ کوردی، بەهاوکاری کیدایتینە، مۆسکۆ ١٩٧٧

٢. هۆنراوەی ئافرەتی کورد، هەولێر ١٩٨٠.

٣. رێزمانی کوردی، بەهاوکاری د. نەسرین فەخری، هەولێر ١٩٨٢.

٤. رێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی لە زمانی رووسییەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، بەغدا ١٩٨٤.

٥. ناوی کچ و کوڕانی کوردی، چاپی سێیەم، هەولێر ١٩٨٥.

٦. بیست چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی، هەولێر ١٩٨٤.

٧. کەشکۆڵی گیو. بەرگی یەکەم، بەغدا ١٩٨٦ .

٨. سینتاکسی رستەی سادە لە زمانی کوردیدا، بەغدا ١٩٨٦

.

٩. زارە کوردییەکان، بە هاوکاری: د. کامل بەسیر، سادق

بەهائەددین و حەمەمین هەورامانی، هەولێر ١٩٨٧.

١٠. کەشکۆڵی گیو، بەرگی دووەم، هەولێر ١٩٨٨.

١١. قواعد اللغه الكرديه، بغداد ١٩٨٩.

١٢. رەنگدانەوەی دۆزی ژن بەنێوی ژنەوە لەنێو ڕۆژنامەگەری کوردیدا (١٨٩٨ ـ ١٩٧٠)، هەیرنفەین ١٩٩٥.

١٣. تیشکێك لەسەر زمانانی کۆنی کوردستان (زمانانی خووری و ئورارتوو)، هەیرنفەین ١٩٩٥.

١٤. ژنی کورد و دۆزی نەتەوایەتی، هەیرنفەین ١٩٩٥.

١٥. سینتاکسی رستەی کوردی، هەیرنفەین ١٩٩٧.

١٦. ژنی کورد بەستەم دەورەدراوە، هەیرنفەین ١٩٩٨.

١٧/ رەنگدانەوەی دۆزی ژن بەنێوی ژنەوە لەنێو ڕۆژنامەگەری کوردیدا (١٨٩٨ ـ ١٩٧٠)، هەولێر ١٩٩٨

١٨. تیشکێك لەسەر زمانانی کۆنی کوردستان (زمانانی خووری و ئورارتوو)، هەولێر ١٩٩٩.

١٩. ژنی کورد بەستەم دەورەدراوە، هەولێر ١٩٩٩.

٢٠. نا بۆ شوێنکەوتەیی، هەیرنفەین ١٩٩٩.

٢١. چەند بابەتێك لەسەر ڕێبازی خوێندنی سەرەتایی لە هۆڵەندەدا، هەیرنفەین ١٩٩٩.

٢٢. سینتاکسی رستەی کوردی، هەولێر ٢٠٠٠.

٢٣. گۆڤاری روناکی، هەولێر ٢٠٠١.

٢٤. گۆڤاری زاری کرمانجی، هەولێر ٢٠٠٢.

٢٥ . نا بۆ شوێنکەوتەیی، هەولێر ٢٠٠٢.

٢٦. ناوی کچ و کوڕانی کوردی، چاپی چوارەم، هەولێر ٢٠٠٢.

٢٧. کۆنگرەی یادەوەری سەد ساڵەی بارزانی نەمر، بە هاوکاری: مومتاز حەیدەری و د. دلێر ئیسماعیل حەقی شاوەیس. بەشی یەکەم و دووەم، هەولێر ٢٠٠٣.

٢٨. مؤتمر الذكرى المئويه لميلاد البارزاني الخالد، بمشاركه ممتاز الحيدري و د، إسماعيل حقي شاويس، هولير ٢٠٠٣.

٢٩. گۆلزارێکی وشە لە یادی سەد ساڵەی بارزانی نەمر، بە هاوکاری: مومتاز حەیدەری و د. دلێر ئیسماعیل حەقی شاوەیس، هەولێر ٢٠٠٣.

٣٠. دەنگی ژنی هۆڵەندی لەنێو چاپەمەنییەکانیدا، هەولێر ٢٠٠٤.

٣١. سینتاکسی رستەی تێکەڵ. هەولێر ٢٠٠٤.

٣٢. شێوەی سلێمانی زمانی کوردی، د. زەرێ یوسوپۆڤا، لە زمانی رووسییەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠٥.

٣٣. فەرهەنگی گەورەی من، لە زمانی هۆڵەندییەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠٦.

٣٤. دیوانی ئەسیری، هەولێر ٢٠٠٦.
٣٥. یەکەم فەرهەنگی تۆ، لە زمانی هۆڵەندییەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، هەولێر ٢٠٠٧.
٣٦. فەرهەنگی هەراشان، هەولێر ٢٠٠٧.
٣٧. باری سیاسی ئافرەتی کورد لە باشووری کوردستاندا، بە سێ زمان: کوردی ـ عەرەبی ـ ئینگلیزی، هەولێر ٢٠٠٧.
٣٨. سەردەمانی زمانی کوردی و کۆمەڵە زمانانی ئێرانی، هەولێر ٢٠٠٨.
٣٩. دوران های زبان کوردی و مجموعه زبان های ایرانی، وەرگێر: مستەفا ئیلخانی زادە، هەولێر ٢٠١٢.
٤٠. قواعد اللغه الكورديه، طبعه ثانيه منقحه، بغداد ٢٠١٣.
٤١. بعض جوانب النحو الكوردي، بغداد ٢٠١٣.
٤٢ . دوانامەی گیو بۆ کۆڕی زانیاری کورد، هەولێر ٢٠١٣.
٤٣. پەیڤەکانی شاووشکا، هەولێر ٢٠١٣.
٤٤. سیر تطور زبان کردی و مجموعه زبان های ایرانی، وەرگێر: مستەفا ئیلخانی زادە، تهران ٢٠١٥.
٤٥. دوانامەی گیو بۆ کۆڕی زانیاری کورد، چاپی دووەم، هەولێر ٢٠١٥.
٤٦. فەرهەنگی کوردستان، دانانی گیو موکریانی، پێداچوونەوە و زێدەکردنی: کوردستان موکریانی، چاپی

دووەم. هەولێر ٢٠١٧.

٤٧. فەرهەنگی نۆبەرە، دانانی گیو موکریانی، پێداچوونەوە و زێدەکردنـی: کوردسـتان موکریانی، چاپـی دووەم، هەولێر ٢٠١٧.

٤٨. مۆرفۆلۆژیا، هەولێر ٢٠١٧.

٤٩. نامەی دڵی ئەحمەد هەردی، هەولێر.

٥٠. چەنـد بابەتێـك لەبارەی زمانی کـوردی ـ کۆبەرهەمی ژمارە ٢ . لە بڵاوکراوەکانی تۆری میدیایی ڕووداو، هەولێر ٢٠١٩.

٥١. گوڵچنـی گیو ـ کۆکردنـەوەی گیو موکریانی و بژارکردن، ڕێکخستن، ساخکردنەوە و زێدەکردنی کوردستان موکریانی، لە بڵاوکراوەکانی تۆری میدیایی ڕووداو ، هەولێر ٢٠١٩.



## لێکۆڵینەوەی بڵاوکراوە:

١ـ ئامرازەکانی خستنەسەر لە زمانی کوردیدا. گۆڤاری زانکۆ. بەرگی ٤ . ژمارە ١ . بەغدا ١٩٧٨.

٢ ـ ئافرەت لە هۆنراوەی کوردیدا. سلێمانی ١٩٨٧.

٣ـ المرأه فی الشعر الکوردی. سلیمانیه ١٩٧٨.

٤ـ جۆرەکانی جێناو و دەوریان لە رستەی کوردیدا. گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کوردی. ژمارە ٧ . بەغدا ١٩٨٠.

٥ـ جۆرەکانی رستە لە زمانی کوردیدا. گۆڤاری زانکۆ. ژمارە ١ . بەرگی ٦ . بەغدا ١٩٨٠.

٦ ـ دەنگی ئافرەتی کورد لەنێو هۆنراوەکانیدا. گۆڤاری بەیان. ژمارە ٦٣. بەغدا ١٩٨٠.

٧ ـ ناو لە رستەی کوردیدا. گۆڤاری زانکۆ. ژمارە ١. بەرگی ٧. سلێمانی ١٩٨١.

٨ ـ ئاوەڵناو لە رستەی کوردیدا . گۆڤاری کاروان. ژمارە ٥ . هەولێر ١٩٨٣.

٩ـ حەبیبەی نالی کێ بوو؟ گۆڤاری بەیان. ژمارە ٨٦ و ٨٧ . بەغدا ١٩٨٣.

١٠ـ چۆنیەتی نووسینی چاوگەی نەسادە. گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق ـ دەستەی کوردی . بەرگی ٩ . بەغدا ١٩٨٣.

١١ـ چۆنیەتی پەرەسەندنی ئۆرتۆگرافی لە رۆژنامەگەری

کوردیدا . گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژمارە ١٠٢ . بەغدا ١٩٨٤.

١٢- لەگەڵ نۆبەرەی رۆژنامەگەری کوردیدا . گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژمارە ١٠٦ . بەغدا ١٩٨٥.

١٣ - تیشکێك لەسەر گۆڤاری روناکی . گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ . ژمارە ١٠٧ . بەغدا ١٩٨٥.

١٤- رستەی شوێنکەوتووی کات. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژمارە ١١١ . بەغدا ١٩٨٦.

١٥- رستەی شوێنکەوتووی هۆیی. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژمارە ١٢٤. ١٩٨٩.

١٦- رستەی شوێنکەوتووی مەرج. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژمارە ١٢٥. ١٩٩٠.

١٧- رستەی شوێنکەوتووی پێوانە. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ. ژمارە ١٢٦ . ١٩٩٠.

١٨- رستەی شوێنکەوتووی پێچەوانە. گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە ١٢٨. بەغدا ١٩٩٢.لاپەڕە ٤٦-٥٣.

١٩- چەند سەرنجێك لەسەر زمانانی خووری و ئورارتوو. گۆڤاری زانکۆ. ژمارە ١ . هۆڵەندا ١٩٩٤.

٢٠ - Een Blik op de Choeri en Orartoe Talin. Zanko. No. ١. Nederland. ١٩٩٤.

٢١- Barawirdkirina Hinek Taybetiyen Dialektologi

Navbara Zaravayen Kurmanciya Jorin u Navin. Kovara
.Berlin .١٩٩٥ Adar .١ Lekolin. Hijmar

Volgorde van de Zinsdelen in de Koerdische -٢٢
١٩٩ Taal. Nederland

٢٣- شـوێنی فرێـزی ناوی و فرێزی کاری لەنێو رسـتەی کوردیدا. گۆڤاری رامان. ژمارە ٤٢. هەولێر. ٢٠٨ - ٢١٢.

٢٤- ئافرەتـی کورد لەنێوان ژەمانی وڵات و رەوگەدا. گۆڤاری رامان. ژمارە ٤٤ هەولێر ٢٠٠٠.

٢٥- ژنـی کـورد لەنێـوان دوو دنیـای (مەکـە) و (بکـە) دا. گۆڤاری رامان . ژمارە ٥٥ . ٢٠٠١/١/٥. گۆڤاری شاووشـکا. ژمارە ٢. هاوینی ٢٠٠١.

٢٦- اصـول التنوع اللغوی فی کرکوك. بحث قدم الی مؤتمر کرکوك فی ٢٠٠١/٧/٢٢ لندن.

٢٧- تێکسـتێك بـە زمانی مـاد. ئەکادیمی - گۆڤـاری کۆڕی زانیاری کوردستان. ژمارە ١. ٢٠٠٢.

٢٨- باری سیاسـی ئافرەتی کورد لە باشـووری کوردسـتاندا. کۆنگرەی یادەوەری سەد ساڵەی بارزانی نەمر. ٢٠٠٣.

٢٩- الوضـع السیاسـی للمـرأە الکوردیـە فـی کوردسـتان الجنوبیـە. مؤتمر الذکـری المئویـە لمیلاد البارزانـی الخالد. ٢٠٠٣.

٣٠ـ ئافرەتـی رووناکبیـری کورد و رۆڵی لە بەرەوپێشـبردنی جڤاکدا. گۆڤاری شاووشکا. ژمارە ١٧. بەهاری ٢٠٠٦.

٣١ـ زمان و ئاسایشـی نەتەوەیی، رۆڵی ماسمیدیا. دیداری ماسمیدیا. هەولێر ٢٠١٦/٢/٢١.

٣٢ـ ئاستی زمان لەنێو هۆنراوەکانی حەمەسەعید حەسەن دا، گۆڤـاری قەڵای زانسـت، ژمارە ٤، بەرگـی ٢ ژمارە ٤ ئابی ٢٠١٧ لاپەڕە ١ ـ ١٣.

٣٣ـ وێنـەی رەگەزی مێ لەنێو هۆنراوەی کوردیدا، گۆڤاری قەڵای زانست، ژمارە ٦، ٢٠١٨ ٣٤ ـ وێنەی رەگەزی نێر لەنێو هۆنراوەکانی ناز کاکەییدا. گۆڤاری قەڵای زانست، ژمارە ؟

٣٥ـ وێنـەی رەگەزی مێ لەنێـو هۆنراوەکانی نیگار نادردا، گۆڤاری قەڵای زانست، ژمارە ؟



# پێرست

لەم بەرهەمەدا ئەم وێنانە شیکراونەتەوە، کە قوبادی جەلیزادە لەنێو دیوانی ژنێک لە جنسی باراندا بە وشە بۆ ڕەگەزی مێی کێشاون.

قوبادی جەلیزادە لەنێو شائیرانی کورد بەوە نێودارە، کە ناوەڕۆکی زۆربەی هۆنراوەکانی بۆ جەستەی ڕەگەزی مێ تەرخان‌کردووە و بەتایبەتی بۆ باخی سێوان.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدراوە بزاندرێت ئایا جەلیزادە هەر جەستەی ڕەگەزی مێی مەبەستە، یان پەلی بۆ بابەتانی دی، کە بەندیواری بە ژنەوە هەیە، هاویشتووە؟

ئایا جەلیزادە لە وێنەکانیدا هەر ڕووکەشی دەرەوەی ئافرەتی خستۆتەڕوو، یان ناخی دەربڕیوە و بایەخی بە ڕۆڵی گرنگی لە ژیانی ڕۆژانەیدا داوە؟ جەلیزادە تا چەند ڕاستگۆیانە لە خۆی دواوە و ڕاشکاوانە ڕازی دڵی خۆی بۆ خوێنەر و بۆ هاوڕەگەزی بەرامبەری درکاندووە؟ جۆری وێنەکانی بەرجەستەکراو، ئایا ئەرێنین، یان وێنەی ئەرێنین و ...؟


ISBN:978-600-6962-72-6



خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا
سلێمانی سەرەتای شەقامی مەولەوی
فەرعی سەعید تەها کۆیی
٠٧٥٠١١٢٨٣٨٨ - ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧
Ktebxanai chwarchra